چاپی دووەم

# 100 بیرۆکە بۆ بەڕێوەبردنی پۆل

پوختەی کتێبی(100 بیرۆکەی جۆنی ینگ
بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ هەڵسوکەوت و خووی قوتابییاندا)





پوختەکردنی
سلێمان بن احمد السوید

وەرگێڕانی
حەنان عومەر عەبدوڵڵا



# ١٠٠ بیرۆکە
# بۆ بەڕێوەبردنی پۆل

پوختەی کتێبی(١٠٠ بیرۆکەی جۆنی ینگ بۆ
مامەڵەکردن لەگەڵ هەڵسوکەوت و خووی قوتابیاندا)

پوختەکردنی:

سلێمان بن احمد السوید

وەرگێڕانی:

حەنان عومەر عەبدوڵڵا

پێداچوونەوەی:

حەیدەر ئیبراهیم

## ناسنامەی کتێب


* ناوی کتێب: ١٠٠ بیرۆکە بۆ بەڕێوەبردنی پۆل
* نووسینی: جۆنی ینگ
* پوختەکردنی: سلێمان بن احمد السوید
* وەرگێڕانی: حەنان عومەر عەبدوڵڵا
* پێداچوونەوەی: حەیدەر ئیبراهیم
* دیزاین: هونەر عوسمان
* قەبارە: ١٣*٢٠ سم
* ژمارەی لاپەڕە: ٦٧ لاپەڕە
* تیراژ: ٥٠٠ دانە
* نرخ: ٢٥٠٠ دینار
* نۆبەتی چاپ: چاپی دووەم/٢٠٢٢
* شوێنی چاپ: ناوەندی سارا_ سلێمانی

له بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان،
ژمارەی سپاردن(     )ی ساڵی ٢٠٢١ی پێدراوە




ناوەندی سارا

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

سلێمانی_بازاڕی ناوبازاڕیك_ نهۆمی دووەم_ بەرامبەر کاسۆمۆڵ

# پێشەکیی پوختەکار

سوپاس بۆ خوای بەرز و مەزن. سوپاس بۆ ئەو زاتەی بە پێنووس فێری کردین و مرۆڤی فێری چەندین شت کرد کە نەیدەزانی. پاشان درووود لەسەر پێغەمبەری مرۆڤایەتی و نێردراوی ڕەحمەت بۆ جیهان و لەسەر کەسوکار و هاوەڵانیشی بێت.

پاش کتێبی ١٠٠ بیرۆکە بۆ مامەڵەکردن لەگەڵ هەڵسوکەوتی قوتابییاندا لە نووسینی "جۆنی ینگ"ە، کە چاوم بەم کتێبەدا خشاند خاڵی جوان و بەسوودم تیا دۆزییەوە، بۆیە ویستم لەگەڵ خوشك و برایانم هاوبەشییان پێ بکەم، لەڕێی بڵاوکردنەوەی ١ بیرۆکە لە ڕۆژێکدا، تاوەکوو ئەوانیش سوودی لێ ببینن.

بیرۆکەکان بە شێوازێکی کورت دەگێڕمەوە گەرچی چەند تێبینییەکی لەسەر بێت، بۆ ئەوەی لە کۆڕبەندەکاندا دەرگای گفتوگۆ لەگەڵ هاوڕێیاندا بکاتەوە. گرنگیی توانای بەڕێوەبردنی پۆل لەوەدا دەردەکەوێت کە ڕەنج و زانیاریی مامۆستا چەند بەهێز بێت کار ناکاتە سەر قوتابییان، گەر پۆلەکە –بۆ پێشوازیکردن لە زانیارییەکە– ئامادە نەبن. ئەمەش بە ڕێگای کۆنترۆڵکردن و ڕێکخستنی تەواوی پۆلەکە دەبێت.

کتێبەکە لە ١٠٠ بیرۆکە پێکدێت بۆ یارمەتیدانی مامۆستا لە بەڕێوەبردنی پۆلەکەی و مامەڵەکردن لەگەڵ قوتابییاندا. ئەم خاڵانە بۆ حەوت بەش دابەش کراون کە ئەمانەن:

١- قوتابییەکانت بناسە.

٢ـ چۆن لە بەرانبەر گەردەلوولی پۆلدا پارێزگاری لە ئارامیت دەکەیت؟

٣- چۆن لەناو پۆلدا شتەکان لە شوێنی ڕاستی خۆیاندا بهێڵینەوە؟

٤- چارەسەرکردنی کێشە باوەکان.

٥- دەرکردنی پاداشت و سزا.

٦ـ بە شێوەیەکی گشتی: مەبەست لەمە بوونی چەند بیرۆکەیەکە کە لەناو پۆلدا پەیوەندیت لەگەڵ قوتابییەکانتدا لە پەیوەندیی مامۆستا بە قوتابییەکەیەوە زیاتر بێت.

٧- چۆن خۆت بەڕێوە ببەیت؟

ئەمە ماڵپەڕی ناساندنی کتێبەکەیە لە کتێبخانەی
http://www.obekanbookshop.com/new.releases

ئەمەش پوختەی ئەم کتێبەیە کە چەندین خاڵی دەروونی و پەروەردەیی تێدایە و لەلایەن شارەزایانی پەروەردەیی وەك ئێوەوە بەکار دەهێنرێت.

# پێشەکی

نووسەری ئەم کتێبە بۆ ماوەی ١٦ ساڵ وەك فەرمانبەر لە یەکێك لە بانکەکان کاری دەکرد، بەڵام دەیوت خەونی ژیانم ئەوەیە کە ببم بە مامۆستا و ئارەزووم دەکرد بەتەواوەتی کاریگەریم لەسەر نەتەوەیەك هەبێت. بۆ بەدیهێنانی ئەم خەونەی، دەستی بە خوێندنی نیودەوام کرد لە زانکۆیەکدا. دوای تەواوکردنی، وەك ڕاهێنانێك بۆ خۆی، دەستی بە وانەوتنەوە کرد بە فەرمانبەرانی بانکەکە، هەروەها لە ئێواراندا خولی فێرکردنی بۆ بەتەمەنەکانیش کردەوە.

کاتێك وانەوتنەوەکە دەستی پێ کرد، سەری سوڕما و وتی: "بەڕاستی ئەو وانانە وەك مەیدانی شەڕ بوون. ڕاستە من زۆر بەباشی قوتابییەکانم دەناسی، بەڵام کێشەکە لەوەدابوو نەمدەزانی چۆن وانەیان پێ بڵێمەوە. قوتابییەکان هەستیان بە بێزاری دەکرد، دەیان هەڕەشەم لێ دەکردن و سزای گشتیم بۆ دەردەکردن، بەڵام لە کۆتاییی وانەکەدا ماندوو و بێئومێد دەردەکەوتم."

نووسەرەکە لە ڕاستی فێرکردن بێئومێد نەبوو و لۆمەی قوتابییەکان و شتی تری نەدەکرد، بەڵکوو بیری دەکردەوە کە دەتوانێت چی بگۆڕێت. پێش کەسانی دی هەڵەی لە

خۆیدا دۆزییەوە، بۆیە چەند گۆڕانکارییەکی لە خۆی و دواتر لە وانەی فێرکردنەکەیدا کرد. ئەمەش لە ڕێی بەشداریکردنی لە "وانەی ڕوونکردنەوەیی" لەلایەن مامۆستایانی زۆر بەئەزموونەوە.

شێوازی وانەوتنەوەی خۆی لەگەڵ شێواز و ستایلی ئەوان بەراورد کردووە و دەڵێت:

"دەستم کرد بە پرسیارکردنی زۆر لێیان و تێبینییەکانیانم لە تیانووسدا دەنووسیەوە تا تیانووسی زۆرم کۆکردەوە." پاشانیش دەڵێت، "کاتێک یەکێك لە وانەکانم سەرکەوتوو دەبێت، دوای وانەکە دادەنیشم بیر لە هۆکاری سەرکەوتنی دەکەمەوە و دواتر هۆکاری سەرەکیی سەرکەوتنی وانەکە دەنووسم."

بەم شێوەیە چەندەها ئەزموون و شارەزاییی کۆکراوەی دەبێت کە لە ئەزموون و جێبەجێکردنی تایبەتی خۆین و بۆ مامۆستا و کەسانی تری دەرکرد و بڵاوی کردنەوە، لەگەڵ ئەوەشدا خۆی مامۆستای ناوەندی بوو.

تۆش برای ئازیزم، مامۆستا و سەرپەرشتیار، باوەڕناکەم توانا و کارامەییت لەم مامۆستایە کەمتر بێت تا ئەزموونت و ئەو شتانەی لە کاتی فێرکردندا بەسەرت دێن نەنووسیتەوە.

# بەشی یەکەم
# قوتابییەکانت بناسە

**١ـ زانینی ناوەکانیان.**

ڕێگاکانی لەبەرکردنی ناوەکانیان:

* بەپێی ئەلفبێی ناوەکانیان شوێنەکانیان ڕێك بخە.

* ناوەکانیان لەسەر کورسیی دانیشتنیان بنووسە.

* بۆ هەر پۆلێك خشتەیەك دابنێ کە شوێنی دانیشتن و ناو و وێنەی هەر خوێندکارێکی لەسەر نووسرا بێت.

کتێبێکی بچووك و بەسوود هەبوو بە ناوی (ئەرێ فلان ناوی چی بوو؟) ئەم کتێبە یەکێکە لەو کتێبانەی بەهرەی لەبیرمانەوەی ناوەکانت پێ دەبەخشێت. ئیتر هیچ ناو و شێوەیەکت بیرناچێتەوە. لە نووسینی "کریکۆرچتاو"ە کە یەکێکە لە خاوەن مێشك و بیرگە بەهێزەکان.

**٢ـ گرنگی و بەرژەوەندیی قوتابییەکانت بزانە:** ئەمە یارمەتیدەرت دەبێت لە هەڵبژاردنی ئەو بابەتانەی بە لایانەوە سەرنجڕاکێشە هەروەها لە هەڵبژاردنی ئەو نموونانەی کە وایان لێ دەکات لە وانەکەدا گوێ بگرن و سەرنج بدەن.

دەتوانرێت ئەمە لە سەرەتای دەستپێکردنی ساڵی نوێی خوێندندا جێبەجێ بکرێت.

**٣- لە ڕێگەی زانینی ئامانجەکانیانەوە هاندانی پەروەردەییان بەرز بکەرەوە.**

ئەم بیرۆکە لە بیرۆکەی دووەمەوە نزیکە لەڕووی سەرچاوە و ڕێگا بەکارهاتووەکان بۆ بەدیهێنانی بیرۆکەکە، بەڵام لە جۆری هانداندا لە یەك جیاوازن.

بێگومان جۆراوجۆریی هاندان بە خاڵێکی گرنگ دادەنرێت بۆ مسۆگەرکردن و بەردەوامیی سەرنج و وریایی قوتابی.

هەر بەم جۆرە ئەم هاندانە بە هاندانی ناوەکی دادەنرێت کە لە هاندانی دەرەکی بەهێزتر و مسۆگەرترە.

**٤ـ بەرزکردنەوە و زیادکردنی هەستی گرنگیی کاری قوتابی:**

زۆربەی کات قوتابییە لاسارەکان باوەڕیان بە خۆیان کەمە و هەست دەکەن ئەوەی دەیکەن هیچ سوود و بەهایەکی بۆیان نییە. برای پەروەردەکار، ئەوەی لە تۆ داوا دەکرێت ئەوەیە ڕێز و پێزانین و بەها بۆ هەر ڕەن و هەوڵدانێکی قوتابی دابنێیت و گرنگیی ئەم ئەرکەی لەسەر ژیانی خۆی و کەسانی تردا بۆ دەربخەیت. نموونە لەو ئەرکانەی: ئامادەبوونی لە قوتابخانە، هێنانی کەلوپەلی قوتابخانە،

دروستنەکردن بێزاری و ئاژاوە لە پۆلدا، پاکوخاوێنیی خۆی، هاوکاریکردنی هاوڕێکانی، نووسینی ئەرکی ماڵەوە و بەشداریکردنی لە چالاکیی ناو پۆلدا هەرچەندە کەمیش بێت.

بیرت نەچێت ئەمە دووبارە بکەیتەوە، چونکە لەوانەیە یەکەمجار باوەڕت پێ نەکات، بەڵام لەگەڵ دووبارەکرنەوەیدا بیری بەهای کاری بۆ دروست دەبێت و لە ناخیدا هەستی پێ دەکات. ئەمەش دەبێتە پاڵنەرێك بۆی تا کاری لەسەر بکات.

### ٥- هەستی گاڵتەوگەپت هەبێت:

بۆ ئەوەی کەشێکی ئارەزوومەندکراو بۆ هەمووان- مامۆستایان و قوتابییان- دروست بکەیت، گاڵتە و خۆشی گرنگن. دەبێت لە کاتی جێبەجێکردنی ئەم بیرۆکەیەدا، ئاگادار بیت. وریابە:

أ- لە کاتێکدا هەستی گاڵتەکردن بەکار بهێنە کە توانات هەبێت ئەوەی لە دوای گاڵتەکردنەکە ڕوودەدات، کۆنترۆڵ بکەیت و لە دواییدا توانای ڕێکخستنی پۆلەکەیشت هەبێت و ڕێچکەی بابەتەکانی وانەکەت لەدەست دەرنەچێت.

ب - با گاڵتەکردنەکەت تایبەت بێت بە خۆت و وانەکەت و ئەو بابەتەی پێشکەشیان دەکەیت. وریابە گاڵتە بەو شتانە نەکەیت کە پەیوەندییان بە خودی قوتابییەکانەوە، یان بە

بـەها ئاسـاییيە تایبەتییەکانیانـەوە، بـە وڵات یـان بـە هــەر شتێکەوە هەبێت کە لای ئەوان بەبەها بن.

دڵنیابە ئەو گاڵتەیـەی کـە قوتابییـەك دەگرێتـەوە، هـەرگیز لەبیری ناکات و بە تانە سەیری دەکات.

گەر بیتوانیبا لـەو کاتـەدا وەڵامـت بداتـەوە، ئـەوا دەیکـرد. بەڵام لەبەرئەوەی ناتوانێت وەڵامت بداتـەوە، ئـەو داخـەی لـە ناخیدا هەڵدەگرێت و ڕێگر دەبێت لەوەی کە سوود لە خـۆت و زانستەکەت وەربگرێت.

### ٦- دۆست یان دوژمن؟

هەنــدێك مامۆسـتا دەیانــەوێت لــە قوتابییــەکانیان نزیــك ببنــەوە. ئەمــەش شــتێکی باشــە، بــەڵام دەبێــت وریــا بــن زیادەڕۆی لەمەدا نەکەن، چونکە ڕۆڵی مامۆستا، لـەناو پۆلـدا، سەرکردایەتی و ڕابەرایەتیکردنە. پێشبینیی سەرکردایەتی بێ توند و پتەوی مەکە. ئەمەش واتای توند و پتەوی ناگەیەنێت لە کاتی خۆیدا نەبێت.

لەبەرئەوەی ئەگـەر زۆر توونـد بیـت، ئـەوا خـۆت دەخەیتـە بەربەرەکانییـەوە لەگـەڵ قوتابییـەکان. ئەگـەریش زۆر نـەرم بیــت، ئــەوا وەك پارووییــەکی ئاســان و ئامــادەکراو ســەیرت دەکـەن. بۆیـە هــەر لــە ســەرەتاوە ســنوور بـۆ پەیوەنـدیی

نێوانتــان دابــنێ، ئــیتر لــە کێشــەی زۆر ڕزگــارت دەبێــت و دەحەسێیتەوە.

**٧ــ هەڵوێســتت یارمەتیــدەرت دەبێــت:** مەبەســت لــەم ناونیشانە "دەروونە". دەروونت لە کاتی چوونت بۆ وانەکە کاریگەریی زۆری لەسەر ئاست و زانیارییەخشینت دەبێت کە ڕەنگدانــەوەی لەســەر گشــت لایەنــەکانی زانیارییەخشــینت دەبێت وەك: زانیــاری، هەڵسوکەوت و زارەکــی. لەبــەر ئــەوە هەوڵبدە کۆنترۆڵی هەستەکانت بکەیت و هەستی گەشبینی و دڵخۆشی بۆ ناخت زیاد بکەیت، هەرچەندە گەر بە ڕووکەش بێت و ڕاستی نەبێت.

نووســەرەکە دەڵێــت: "بۆمــاوەی ٥ بــۆ ١٠ خولــەك خــۆت دڵخۆش نیشان بدە، گۆڕانکارییەك بەدی دەکەیت."

**٨ــ ئەستێرەی ئەمڕۆ:** بــە قوتابییــەکانت بڵــێ کــە هــەموو ڕۆژێــك قوتابییــەك هەڵدەبــژێرێت و لەگەڵیانــدا پێوەرەکــانی جیاکاریش دیاری بکە.

**پێوەرەکانی جیاکاریش ئەمانەن:**

١- ڕەنجدان: لەوانەیە قوتابییەکە ڕەنجێکی زۆر بدات لە فێربوونــدا، بۆیــە شایســتەی ڕێزلێنــان و پێزانینــە لەســەری، گەرچی نەگەیشتە ئەنجامی ڕاستیش.

٢ـ بەهۆی باشی و جیاوازیی ئاستی.

٣ـ وریایی و ئاگاداری لەناو پۆلدا...هتد.

لە کۆتاییی وانەکەدا ئەستێرە (قوتابی)ی ئەمڕۆ دیاری دەکرێت و باشتروایە ناوی و هۆکار و ڕێکەوتی هەڵبژاردنی هەڵبواسرێت لەبەردەم قوتابییەکاندا، بۆ ئەوەی ببێتە هاندەرێك بۆ قوتابییەکانی تر. ئەم بیرۆکەیە خواستی ناوەکیی تاك دەقۆزێتەوە بۆ ئەوەی دەربکەوێت و جیاواز بێت.

# بەشی دووەم
# چۆن لە کاتی گەردەلوولی پۆلدا پاریزگاری لە هێمنی (ئارام)یت دەکەیت؟

**١ـ بەهێزیی ڕێکخستن:** کاتێك لەناو پۆلدا پێویستت بە شتێك دەبێت وەك پێنووس، دەفتەر...هتد و پێت نەبێت، ئەوا ناچار دەبیت لە قوتابییەکی دیکە یان لە پۆلەکەی تەنیشتت وەری بگریت. ئەمەش جوڵە و دەنگی نەویستراو لەناو پۆلدا دروست دەکات.

هەموو ئەمانە بە ڕێکخستنی پێشوەختەی پۆلەکە و ئامادەکردنی پێداویستییەکانی وانەکە نامێنن. بەم شێوەیە دەتوانین بەوپەڕی نەرمی و ئاسانییەوە وانەکە بڵێینەوە. ئەمەیش پشت دەبەستێت بە پێشبینییت بۆ ئەو ڕاهێنان و تاقیکردنەوانەی کە قوتابییەکانت خۆیان بۆ ئامادە نەکردووە و پێویستیانە لێت کە بۆیانی دابین بکەیت.

**٢ـ گەشبین بە (کەسێکی ئەرێنی بە):** مەبەستی لێی ئەوەیە، کاتێك دەتەوێت قوتابییەکانت ئاگادار بکەیتەوە، یان هەڵسوکەوتەکانیان ڕاست بکەیتەوە، دەبێت دەستەواژەکانت

پێکهاتبن لەو شتانەی لێیان داوا دەکەیت نەك وەسفی هەڵسوکەوتە هەڵەکە بکەن بۆ نموونە:

"پێشتر ئاگادارم کردیتەوە کە واز لە قسەکردن بهێنی، بەڵام تۆ سووریت لەسەر بێزارکردنم." لە جێی ئەم ڕستە نووسەرەکە پێشنیاری ئەم ڕستەیەت بۆ دەکات، "زۆر باشە، وا دیارە زۆربەی قوتابییەکان بێدەنگ بوون، جگە لە هەندێکیان تا ئێستا بێدەنگ نین. من چاوەڕوانم تا بێدەنگ دەبن." پێویستە وتەکە بە تۆنێکی پتەو و تووند بووترێت.

**٣ـ لە هاوارکردن بووەستە:** هەرکاتێك ژاوەژاو لە پۆلدا ڕوویدا، دەست بە هاوارکردن مەکە، چونکە هاوارکردن ماندووکەرە، وزەت ناهێڵێت، لەگەڵ قوتابییەکاندا سوودی نییە و لای قوتابییان بە شێوەیەکی نەشیاو دەرت دەخات.

لەبری هاوارکردن ئەم خاڵانەی خوارەوە پەیڕەو بکە:

(بوەستە، چاوەڕێ بکە و لە چاوتدا نیگایەکی دیاریکراوت هەبێت.) لە بیرۆکەی ١٤دا لێدوانێك هەیە سەبارەت بەچۆنیەتیی نیگاکردنی کاریگەر.

دەنگت بە ڕادەیەك نزم بکەرەوە کە قوتابییەکان نەتوانن بیبیستن، هەربۆیە ناچاردەبن بێدەنگ بن تا بیبیستن.

چاوەڕوان بە و بۆ چەند ساتێك سەیری ئەو کەسە بکە کە قسەی لەگەڵ دەکەیت، بەڵام وریابە سەیرکردنەکەت زۆر نەخایەنێت تا هەلی هیچ لێدوانێکیان بۆ دروست نەبێت. بۆ بێدەنگکردنیان، دەستت بەرز ڕابگرە. دوای ئەوە ئەگەری هەیە ناچاربیت کە دەنگت بەرز بکەیتەوە لەبەر ئەوە با بێت لە وتەیەکی کورت و دیاریکراودا و دواتر بگەڕێوە بۆ تۆنە نزمەکە. دەنگت بەرز

**٤ـ گرنگیی زمانی جەستە:** کاتێك لەناو پۆلدا دەبیت، نەك تەنها ٦٠ کەس گوێت لێ دەگرن، بەڵکوو ٦٠ چاویش تەماشات دەکەن. تەنها جەخت لەسەر قسەکانت ناکەنەوە، بەڵکوو جەخت لەسەر جەستەشت –دەستەکانت، چاوەکانت، وەستان و جوڵەکانیشت– دەکەنەوە. بۆیە پێویستە هەموو جوڵەکانت ڕێك بخەیت نەك لەپشت مێزەکە بیانشاریتەوە.

لەگەڵ ئەوەی زمانی جەستە لە گەیاندنی زانیارییەکە و لە بەڕێوەبردنی پۆلەکەیشدا گرنگە.

**ئەمانەیش چەند یاسایەکی زمانی جەستەن لە ڕێکخستن و کۆنترۆڵکردنی پۆلەکەتدا هاوکاریت دەکەن:**

١ـ با نیگا و جوڵەکانت پڕ باوەڕ بن.

٢ـ ڕێك بوەستە.

٣ـ لەڕێی سەیرکردنەکانتەوە، شوێن قوتابییەکانت بکەوە.

٤ـ ئاگادارکردنەوەی قوتابییەکانت لە کردنی چەند شتێك، چەندێك وریایی تۆیان بۆ دەردەکەوێت لەو کارانەی کە دەیکەن.

**٥- نیاسایی ئاماژەکان:** بیرۆکەکە ئەوەیە لەگەڵ قوتابییەکانتدا لەسەر چەند ئاماژەیەك ڕێك بکەون کە لەڕێگای ئەم ئاماژانەوە قوتابییەکان لە داواکەت تێبگەن بەوەش کات و ڕەنجی فێرکردنتان بۆ دەستەبەر دەکات.

بیرۆکەکان لەم بوارەدا زۆر جۆراوجۆرن و مامۆستا دەتوانێت بە دانیشتنێکی کورت لەگەڵ خۆیدا، شێوازی تریان لێ دابهێنێت کە پشت بە جوڵەی جەستە دەبەستێت و هەندێکیان پشت بە شتی دیکە دەبەستن کە لەناو پۆلدا هەڵبواسرێن وەك: هێمای پەڕینەوەی هاتوچۆی ئۆتۆمبێل کە لە هەندێك لە قوتابخانەکاندا بەدیم کردوون...هتد.

**٦- گەشەپێدانی سەیرکردن (تەماشاکردن)ەکەت:** سەیرکردن ڕێگایەکە لە ڕێگاکانی پەیوەندیکردن لەگەڵ قوتابییاندا. دەتوانیت لەڕێی ئەو سەیرکردنە کە پەرەت پێ داوە، ناڕەزایی خۆت دەربارەی هەڵسوکەوتێکی دیاریکراوی قوتابییەك دەربخەیت. بۆ نموونە: وانەوتنەوەکەت پێ

ببچرڕێنێت، بـەڵام دەبێــت ســەیرکردنەکەت ســەیرکردنێکی زیرەکانە بێت و نووسەرەکە ئەم بیرۆکەیـە بـە ڕادەی ئـەوەی بڵێی (سەدهەزار و یەك، سەدهەزار و دوو، سـەدهەزار و سـێ) مەزندە دەکات. دوای ئەوە چاوت لەسەر قوتابییەکـە لاببـە و لـە وانەوتنەوەکـەت بـەردەوام بـە. نووســەرەکە دەشـڵێت: "گەرەنتییت پێ دەدەم ئەم ڕێگایە بـە ڕێگایـەکی زۆر بـەهێز دەبینیت."

٧ـ بـەڕێز بـە، بـەهێز دەبیـت: کاتێـك قوتابییـەك هەڵـەت بەرانبەر دەکـات، ئـەوا لـە بەرژەوەنـدیی تـۆ نییـە بـە هـەمان شێوازی خۆی هەڵسوکەوتی لەگەڵ بکـەیت، بـەڵکوو بەوپـەڕی ڕێــزەوە وەڵامــی بــدەرەوە. بێڕێزیکردنــت وای لــێ دەکـات زیادەڕۆیی بکات بەرانبەرت. هەرچەند بە وتەکانت ئاستت نزم بکەیتــەوە، هــەر تــۆ زەرەرمەنــد دەبیــت، لەبەرئــەوەی تــۆ مامۆستایت.

٨- بــەهێزی، پتــەویی و بــەردەوامی: نــاوەڕۆکی ئــەم شــێوازەش بـۆ دیـاریکردنی ئـەو پێـوەر و سـنوورانەیە کـە دەکرێت قوتابییەکان پێوەی پەیوەست بن. تۆیش دەتوانیـت پەیرەوی بکەیت وەك: زۆریی ئەرکـەکان، سـزاکان کـە کـات و ڕەنجی زۆریان دەوێت، سوپاسکردنی بەردەوام بە تایبەت بـە

نووسین. لە كۆتاییی باسەكەدا، پێت دەڵێم ڕاست بە لە دانانی هەر وێنە و سیستەمێك بۆ پۆلەكەت تا بتوانیت جێبەجێی بكەیت، چونكە جێبەجێنەكردنیان ناڕێكیی پۆل زیاتر دەكات.

زۆرێك لە مامۆستاكان زۆر لەم جۆرە كارە دەكەن وەك: ئەركێكی زۆر بە قوتابییان دەدات، دواتر لەبەر كەمیی كات سەیریشی ناكات و سەحی ناكات بۆی. ئەمەش وا دەكات قوتابییەكان بایەخ بە ئەركەكانیان نەدەن و ئەو هەڵەیەی لە كاتی ئەركیماڵەوە ئەنجامی دەدەن، وەك خۆی بێ ڕاستكردنەوە دەمێنێتەوە.

**٩- میهرەبان بە:** هەرچەند بێزاری لەناو پۆلەكەتدا زۆر بوو، تووڕە مەبە، بەڵكوو هەوڵبدە بە بیر خۆتی بهێنیتەوە كە پێویستە هێمن بیت، چونكە هێمنبوونت لەلای قوتابییەكاندا بە مامۆستایەكی باوەڕبەخۆبوو پیشانت دەدات.

هەڵسوكەوتەكانیان سەرت لێ نەشاوێنن. پاشان بە شێوازێكی ئەرێنییانە ڕەخنەیان لێ بگرە. وەك بڵێیت: باشە، دەبینم زۆربەتان بە شێوەیەكی باش هەوڵ دەدەن، بەڵام لە ئێوەی دەوێت (پێشەوە، دواوە، لای ڕاست، لای چەپ...هتد) ئەوەیە هەوڵێكی زیاتر بدەن. لەوانەیە پێویستیت بە وتەیەكی

بەهێزتر بێت لە وتەکەی ئەمەش بەپێی پێوەری خۆت بۆ هەڵسوکوتی قوتابییەکانت و پێگەیان، بەڵام بیرت نەچێت کە بەڕێز و باش بە.

**١٠- شێوازی سەرنجلادان:** لە کاتێکدا یەکێك لە قوتابییە لاسارەکان هەوڵدەدات تۆ بخاتە ناو مشتومڕێکی بێسوود و کاتبەفیڕۆدەرەوە، هەوڵبدە سەرنجی ئەو لەم هەوڵدانەی لابدەیت ئەوەش بەوەی دانبنێیت بەوەی قسەکانی ڕاستن (گەر ڕاست بن یان کەمێك ڕاست بن)، بەبێ گوێدانە هۆکارە پاڵنەرەکەی بۆ قسەکردن. ئینجا سەرنجی قوتابییەکانت بهێنەرەوە سەر ئەو شتەی کە باست کرد یان بۆ ئەو کارەی هاوڕێ قوتابییەکانیان ئەنجامی دەدەن.

بەمەش تۆ ئەوت فەرامۆش نەکردووە، بەڵکوو گوێت لێ ڕاگرتووە و ئەویش تۆی نەبردە ناو گفتوگۆی شەرمەزارکەر و بێسوودەوە.

**١١- کاردانەوەکانت:** شتێکی بەسوودە کە پێشوەختە بیر لەو کاردانەوانەت بکەیتەوە کە ئەنجامیان دەدەیت، لە کاتی ڕوودانی ئەو کێشانەی پێشبینیی ڕوودانیان دەکەیت، وەك:

* دواکەوتنی قوتابییەکان.
* قسەکردنی قوتابییەکان لە کاتی وانەکەدا.

* نەنووسینی ئەرکەکانیان.

* ئامادەنەکردنی پێداویستییەکانی وانەکە وەك: پێنـووس، پەرتووك...بۆیــە کاتێــك کاردانــەوەکانت لــەناو مێشــکتدا ئامــادەبن، ئــەوا بــە کەســێکی متمانەبــەخۆبوو، وریــاتر و دادوەرتر دەرت دەخات کە سووریت لەسەر سزاکانت بۆیـان و دەشــتوانیت هــەموو کاردانــەوەکانت بنووســیت. ئەمــە یارمەتیــدەرت دەبێــت تــا باشــترینەکان.دیــاری بکــەیت و ئەوانەیشی کـە توانـای پەرەسـەندنیانت هەیـە، پـەرەیان پـێ بدەیت.

١٢ـ دانایی لە دووجـار بیرکردنـەوەدا: وشـە کاریگەرییـەکی گـەورەی ئـەرێنی یـان نـەرێنی هەیـە. لەبـەر ئـەوە کـارێکی داناییيــە بــیر لــە کاریگــەریی ئــەو وشــانەت بکەیتــەوە کــە ئاڕاستەی قوتابییەکانتی دەکەیت، چونکە لەوانەیـە ئـەنجامی وشـەکانت هۆکـار بـن بـۆ دروسـتکردنی ژاوەژاو. هەرچـەندە هەمووان تێڕامانیان بۆ ئەم حاڵە هەیە و لەسـەر گرنگییەکـەی هاوڕان، بەڵام پەیڕەوکرنی زۆر کەمە لەبەرئـەوە بەبـەردەوامی خۆت بە گرنگییەکەی بیر بخەرەوە.

هەروەك لە پەندێکی باودا دەوترێت:

**"بریا دەمم دەمی نەعامە ببوایە، بیر لە وشەکە بکاتەوە بەرلەوەی دەری ببڕیایە".**

**١٣ــ دەستەواژە جادووییەکان:** نووسەرەکە هەندێك دەستەواژەی باسکرد کە زۆر بە کاریگەرییان دەزانێت لە ڕێکخستنی پۆلدا بۆ نموونە:

شتێك بە دەستتەوە بگرە و بڵێ ئایا کەسێکتان دەتوانێت پێم بڵێت ئەمە چییە؟ کاتێك ڕێژەیەکی کەم بەشداریی گفتوگۆکە دەکەن، بڵێ دەی چیتان بەسەر هاتووە؟ تەنها ٣ قوتابی وەڵامەکە دەزانن؟ بێگومان نەخێر! دەی، قوتابیی زیاترم دەوێت.

یان کاتێك دەتەوێت لە سزای کارێك ئاگاداریان بکەیتەوە، بڵێ: من حەز ناکەم ئەم کارە بکەم، بەڵام ئێوە هیچ هەڵبژاردەیەکتان بۆ نەهێشتمەوە. بۆ ئەوەی بێدەنگی بگەڕێتەوە ناو پۆل، بڵێ تکایە دەنگتان نزم بکەنەوە. پێنج، چوار، سێ، دوو، یەك.

# بەشی سێیەم
# چۆن بابەتەکان لە شوێنی ڕاستی خۆیان دەهێڵینەوە؟

**١ـ ورەی قوتابییەکانت بەرز بکەرەوە:** ئەمەش لەڕێی باسکردنی باشییەکانیان و ئەو بەرەوپێشچوونانەی لە ئاستی خوێندنیان و هەڵسوکەوتیاندا ڕوویان داوە.

وەك بڵێیت: سوپاسی حامد دەکەم، لەبەرئەوەی زوو گەیشتە پۆلەکە، یان بۆ کەمیی جوڵەکردنی لەناو پۆلدا، یان بۆ ئەنجامدانی ئەرکەکانی یان بۆ بەشداریکردنی لە باسکردنی وانەکەدا...هتد.

لەبەر ئەوە بەردەوامیی ئەم کردەوەیەت هەوڵی سەرکەوتنیان لەلا بەهێز دەکەیت، پاڵنەریان دەبیت بۆ ئەوەی هەوڵی زیاتر بدەن تا ستایشی نوێ بکرێن.

**٢ـ چۆن سەرەتای وانەکە خۆش و بەچێژ دەکەیت؟**

سەرەتای وانە بڕگەیەکی گرنگە بۆ ڕاکێشانی سەرنجی قوتابی، بۆیە ئاگاداری ئەوەبە کە پێشەکییەکانت هاندەرانە بن. وریابە سەرەتاکانت بە سەرزەنشتکردن و لۆمە و ئاگادارکردنەوەیان نەبێت لە بابەتی شەڕی دواتر لەگەڵ

قوتابییەکان، لەبەر ئەوەی تاکە شت کە زەرەرمەند دەبێت، وانەکەتە. نووسەرەکە چەند پێشەکییەکی دیاری کرد کە بەباشی دەزانێت بوترێن، وەك وتنی: خالید، ئەرکی وانەی پێشووت زۆر بەباشی ئەنجام دا...هتد. لە پێشەکییە ماندەرانەکان، باسکردنی چیرۆکێك یان نوکتەیەکە کە پەیوەندیی بە وانەکەوە هەبێت. ئەمەش پێویستی بەوەیە مامۆستاکە ئاستی ڕۆشنبیریی لە بابەتەکەیدا بەرز بێت.

**٣ـ بەکارهێنانی کارتی گەورەی ڕوونکردنەوەیی:** بیرۆکەکە لە چەند وەڵامێکی کورت پێکهاتووە لە یەك وشە پێکدێت، بۆ نموونە: لەسەر وەرەقەیەکی گەورەی وەك (ئەی فۆر) بنووسرێت، لە کاتی هاتنەناو پۆلیان بدرێت بە قوتابییان، دواتر پرسیاری گونجاو لەسەر ئەو وەڵامانەی کە لە لایانە بکەن و ئەو قوتابییەی وەڵامە ڕاستەکەی لا بێت، دەست هەڵبرێت. تایبەتمەندیی ئەم بیرۆکە لەوەدایە لە سەرەتای وانەکەدا پۆلەکە زۆر ڕێك دەکات، هەروەها چالاك و هەستپێکراوە.

**٤ـ چۆنیەتیی پێدانی ئەرکەکان و کۆکردنەوەشیان:** لەوانەیە لە کاتی پێدانی وەرەقەی ئەرکەکان لەناو پۆلدا و دواتر کۆکردنەوەیان، قوتابییەکان ژاوەژاو و ناڕێکی لەناو پۆلدا

دروست بكەن. بەهۆی ئەمەوە، خوێندكارە لاسارەكان سەرقاڵی مامۆستاكە بە هەل دەزانن تا ژاوەژاو دروست بكەن.

**لەبەرئەوە نووسەرەكە هەندێك ڕێنمایی پێشكەش دەكات تا لەم جۆرە ژاوەژاوە دوور بكەوینەوە:**

* دڵنیابە لەوەی كە قوتابییەكان گوێ لە ڕێنماییەكانی ڕاهێنانەكە دەگرن بە ڕێگەی ئەوەی هەرچی لای تۆ سەرقاڵیان دەكات لە قەڵەم و شتی تر دایبنێن.

* دڵنیابەرەوە كاتەكە بەسە و بەشی كۆكردنەوەی وەرەقەی ئەركەكانیان دەكات، پێش لێدانی زەنگی كۆتایی وانەكە كە هۆكارە بۆدروستكرنی ژاوەژاو و بێزاری بەهۆی پەلەكردنی قوتابییەكان لەوەی ئەركەكانیان بدەن بە مامۆستاكە.

* چییت دەوێت بۆیان ڕوون بكەرەوە پێش ئەوەی دەست بە كۆكردنەوەی ئەركەكانیان بكەیت.

**٥ـ سێینەی جاسووسی:** بۆ ئەوەی لە كاتی ڕاهێنان و چالاكیی ناو پۆلدا ژاوەژاو دروست نەبێت، چەند هەڵبژاردەیەك بە قوتابییەكان بدە كە لە سێ هەڵبژاردە زیاتر نەبێت. ئەم بیرۆكەیش گەرەنتیی بەشداریكردنی هەموو

قوتابییەكانت بۆ دەكات. بەپێی هەڵبژاردەی خودی خۆیان بەشداری دەكەن كە ئەمەش پاڵنەرێكی بەهێزی خۆییە.

**٦ــ جوانیی ئەو پرسیارانەی لە چەند هەڵبژاردەیەك پێكهاتوون:** پرسیاری قورس، یان زۆر ئاسان سەرەتایەكی زۆر سەرلێشێواوكەر دەبێت بۆ قوتابییان.

بۆیە سەرەتا بە پرسیاری ئاسان و دواتر وردە وردە بە پرسیاری قورستر دەست پێ بكە. باشترین نموونەی پرسیاری مامناوەند ئەو پرسیارانەیە لە چەند هەڵبژاردەیەك پێكهاتوون. هەڵبژاردەكان یارمەتیدەر دەبن تا وەڵامی ڕاستت بەبیر بێتەوە.

**٧ـ هاوكاریی زیاتری خۆت و قوتابییەكانت بكە:** ئەگەری هەیە پرسیاری قورس هۆكاری دروستكردنی ئاژاوە بێت لای ئەو قوتابییەی نەتوانێت وەڵامی بداتەوە، بۆیە نووسەرەكە پێشنیار دەكات وەرەقەیەكی زیادە دابنرێت كە هەمان پرسیار وەك دابەشكردنی بۆ چەند بەشێكی بچووكتر بە شێوەیەكی ئاسانتر بنووسرێت. ئەگەر بابەتەكە یان بیرۆكەی پرسیارەكە ڕێگای ئەوەی هەبێت دەتوانرێت نموونەیەك لە چۆنیەتیی وەڵامدانەوەی پرسیار بە هەمان شێوە بنووسرێت.

**٨ـ بەکارهێنانی ئامێرە دەنگییەکان:** نووسەرەکە پێشنیار دەکات کە ئەو بابەتە خوێندنەوەیەی دەتەوێت ڕوونی بکەیتەوە و بە ڕێگەی تۆماری دەنگی پێشکەشی بکەیت. ئەگەر دەنگی کەسێکی تر بێت باشترە، چونکە ئەمە بە دوو شێواز لە ڕێکخستن و کۆنترۆڵکردنی پۆلەکەدا یارمەتیدەرت دەبێت:

یەکەم:ـ سەرنجڕاکێشانی قوتابییەکان جموجوڵیان کەم دەکات.

دووەم:ـ کاتت پێ دەبەخشێت تا چاودێری و ڕێنماییان بکەیت، بۆ ئەوەی ئاگاداریی وانەکە بن بەمشێوەیەش ئەوە هۆکار بوو تا وانەکە بە شێوازێکی وێنەیی پێشکەش بکەیت کە ئەمەیان ڕێگەیەکی باشترە لە بیستن.

من ئەم شێوازەم لە گشت شێوازەکانی تر پێ باشترە بەوەی تەنانەت ئەو مامۆستایەی توانای کۆنترۆڵکردنی پۆلی نەبێت، ئەم جۆرە ڕێگەیەك دەبێت کە بتوانێت ژاوەژاو و لاساریی ناو پۆل کەم بکاتەوە.

بە تایبەت بە زیادکرنی وانەی کۆمپیوتەر بۆ وانەکانی تر و دابینکردنی بڕێکی گونجاوی ئامێری کۆمپیوتەر لە

قوتابخانەکانماندا لە جێی تاقیگە زانستییەکان کە کەمیش بەکار دەهێنرێت.

٩ـ وانەی سەربەخۆ: لەوانەیە مامۆستا زیاتر لە بابەتێك لە یەك وانەدا تەواو بکات. ئەمەش بەهۆی کۆتایی بابەتی یەکەم لە کاتێکی کەمدا یان بە هەر هۆکارێکی تر. ئەم کارە دەبێتە هۆی نارێکیی ناو پۆل و بەشدارینەکردنی قوتابییەکان لەبەر چەند هۆکارێك، لەوانە:

أـ بێزاریی قوتابییەکان.

ب ـ ئامادەنەبوونی پێشوەختەی مامۆستاکە. ئەمەش دەبێتە هۆی ئەوەی چەند بڕگەیەکی وانەی دووەم ناتەواو بن.

١٠ـ **چالاکییە پردییەکان:** زۆر جار بەهۆی ئەوەی لە چالاکیی یەکەمەوە دەچیتە چالاکیی ترەوە، ژاوەژاو و سەرلێشێواوییەك دروست دەبێت لەوانەیە نارەزاییش لەسەر جێهێشتنی چالاکیی یەکەم دروست ببێت. بۆ ئەوەی لە چالاکیی یەکەمەوە بڕۆین بۆ چالاکییەکی تر، بە شێوازی یەك بەدوای یەك و بێ هیچ نارەزاییەك، نووسەرەکە پێشنیارت بۆ دەکات کە پردێك دروست بکەیت، قوتابییەکان بۆ چالاکیی دواتر بپەڕێنێتەوە، لەڕێی ئەوەی داوا لە قوتابییەکان بکەیت کەسێك لە خۆیان هەڵبژێرن تا بەکورتی چالاکییەکەیان و

گرنگترین سێ سوودیشی بۆ هەمووان ڕوون بکاتەوە. ئەمەش وەك بانگەوازێکی دیبلۆماسی دەبێت لەسەر تەواو بوونی چالاکیی یەکەم، بەڵام بە چالاکییەکی پێچەوانە و سەرنجڕاکێش بۆیان، لەبەرئەوەی لەڕێی یەکێك لە قوتابییەکان خۆیانەوە بوو.

**١١- چۆن چالاکییەکان دەگۆڕیت؟**

ئەمەش درێژەی بیرۆکەی پێشترە. پوختەکەی ئەوەیە میکانیزمێکی ڕوون و دیاریکراوت لەگەڵ قوتابییەکان هەبێت کە داوای چییان لێ دەکەیت.

(لە کارەکەت بوەستە، دەست بەکار بە) وا باشترە بە ئاماژە و نیشانە ڕوون و ئاشکرا بکرێت لەلای قوتابییەکان. دەبێت لە کاتی فەرمانکردندا دەستەواژەکانت ڕاستەقینە و توونـد بن. ئەمەش واتای ئەوە نییە کە دەستەواژەکان بێڕێزیکردن بن بە قوتابییەکان.

**١٢- پشوویەکی خۆش و باش:** شتێکی زۆر باشە گەر پشوویەکی کورت بە قوتابییەکانت بدەیت بە تایبەت دوای ئەوەی هاوکارت بوون لە وانەکەتدا. وەك پاداشتێك بۆیان پشوویەکی کورت و باش و ڕێکخراویان پێ بدە، کە قسەکردن تێیدا بەهێمنی بێت. بە ئامادەکردنی برگەی دواتری وانەکە،

تۆش سوود لەو پشووە کورتە وەردەگریت. با پشووەکان زۆر نەبن، بۆ ئەوەی هەموو وانەیەك چاوەڕێی نەکەن.

**١٣- هێمنی و ئارامی لە پێشکەشکردنی وانەکەدا:** هەندێك مامۆستا هەوڵدەدەن وریا بن کە هەموو خواست و پرس و ڕاکانی قوتابییەکانیان لەگەڵ بابەتە زانستییەکان بەدی بهێنن. ئەم وریاییە لەگەڵ ئەوەی جێی سوپاسە بۆی، بەڵام هۆکاریشە بۆ ماندووبوونی کە ئەمەش لە هێزی ئامادەکرنی بۆ بابەتە سەرەکییەکە کەم دەکاتەوە. لەوانەیە لە پێشکەشکردنی وانەکەدا پەلە بکات تاوەکوو بتوانێت هەموو داخوازییەکان بەدیبهێنێت، لەبەرئەوە بەم شێوەیە هەمووی شتێکی لەدەست دەردەچێت.

بۆیە پێویستە پەلە نەکات لە پێشکەشکرنی وانەکەیدا و قبوڵی نەکات لە وانەکەی و ڕوونکردنەوەیدا بوەستێنرێت. دەبێت قوتابییەکانی ئەوە بزانن کە مامۆستاکەیان دەیەوێت گشت داواکارییەکانیان بەجێ بگەیەنێت، بەڵام ناتوانێت هەموویان بەئەنجام بگەیەنێت.

**١٤- بەرزدانان و زیادکردنی لایەنی بیـنین:** بیرۆکەکە پێکهاتووە لە دانانی ئاماژە و نووسین لەناو پۆلدا کە یاسای هەڵسوکەوتی دیاریکراو لە قوتابی لەخۆ بگرێت تا مامۆستاکە

لە کاتی هەر سەرپێچییەکی قوتابییەکاندا یەکێك لە یاساکان بەکار بهێنێت. هێزی کاریگەریی ئەو ئاماژەیە لە پێداگیرکردن و چەسپاندنی لە هەستی قوتابیدا هاتووە کە ئەمەش لە تەماشاکردنی چەند جارەی بۆی لەناو پۆلدا دروست دەبێت، بەلام ئەمەش پەیوەستە بە توونديی مامۆستاکە لە جێبەجێکردنی ئەو یاسایانەدا.

**١٥- خشتەی بەدواداچوونی ڕەفتاری قوتابی:** پێکهاتەی بیرۆکەکە بریتییە لە کارتی ڕەنگاوڕەنگ کە هەر ڕەنگێگ ئاماژەیە بۆ ئاستی بەشداریکردنی ڕۆژانەی قوتابییەکە.

بۆ نموونە: سەوز: نایاب. شین: باش. پرتەقاڵی: پەسەند. ئەم کارتانە لە کۆتایی وانەی ڕۆژەکەدا بەسەر قوتابییەکانماندا دابەش بکرێن. پێویستە لیستێکی ناوی قوتابییەکانمان هەبێت لەگەڵ ناوی هەر قوتابییەك چەند چوارگۆشەیەك هەبێت و هەموو ڕۆژێك چوارگۆشەیەك بەو ڕەنگەی قوتابییەکە لەو وانەدا بەدەستی هێناوە ڕەنگ بکرێت لە بەرچاوی قوتابییەکە. بەم جۆرە دەتوانیت بەئاسانی چاودێریی ئاستی قوتابییەکان و چەندێتیی جێگیربوون، یان گۆڕانی ئاستی لە ماوەی ئەو خشتەیە-مانگانە، ساڵانەدا- بکەیت.

بۆ ئەوەی ئەم بیرۆکەیە سەرکەوتوو بێت، ڕۆژانـە لـە چـەند وانەیەکدا بە شێوازێکی پاڵپشت و هاندەرانە ئەنجامی بدە.

**١٦ـ فایلەکانی ئەنجامدان و تەواوکردن:**

ئــەم بیرۆکەیـــە هەوڵــدەدات هەســـتی باوەڕبـــەخۆبوونی قوتابییەکان بەهێز بکات کە یارمەتیدەر و پاڵنەر دەبێت تا لە پۆلدا بەشداری بکەن. بە کورتی، واتە فایلێکی تایبەت بە هەر قوتابییـەك دابـنێ و هـەموو کـارێکی کـە بـە بەدەسـتهێنانێك دەبینرێت، تێیدا کۆ بکەرەوە. با فایلەکە لەناو پۆلدا بێـت تـا قوتابییەکە ببینێـت، هـەروەها بـەڕوونی و ئاشـکرا ناوەکـەی لەسەر بنووسرێت وەك هاندانێك بۆ ئەو قوتابییانەی ئاسـتیان نزمترە. هەرشتێك کە بە باش هەژمار بکرێت، زارەکـیش بێـت لـەناو وەرەقەیەکـدا بنووسـرێت و لـەناو فایلەکەیـدا دابنرێـت گەرچـی ئـەم بیرۆکەیـە پێویسـتیی بـە ئـەرك و مانـدووبوون هـەبێت، بـەڵام کاریگـەری لەســەر بەرزکردنــەوەی هەسـتی باوەڕبەخۆبوونی قوتابییەکان زۆرە.

**١٧ـ بـەڕێوەبردنی گفتوگۆکـە:** لـەو بیرۆکانـەی کـە بێـزارت دەکەن، دروستبوونی ژاوەژاو و زۆریی قسەکردنە لەناو پۆلـدا. قوتابییەکان بەسەر چەند گرووپ (دەستە)یەکدا دابەش بکە و بـۆ هـەر گرووپێـك ڕابـەرێك دابـنێ. دواتـر نـاوی کۆمەڵـەکان،

ڕێـژەی خاڵـەکانیان و ئـەو خاڵانـەی کـە لەگـەڵ قوتابییـەکان لەسەری هاوڕان لەسەر تەختەکە بنووسە.

**١٨- وەبیرهێنانەوەی دەستهەڵبڕین:** لـە ژاوەژاوە باوەکـانی نـاو پـۆل وەلامدانـەوە، یـان پرسـیارکردنی قوتابییەکانـە بێنەوەی مۆڵەت وەربگرن. ئەمە لـەناو پۆلـدا ژاوەژاو دروسـت دەکات لەبەر ئەوە توونددوتۆڵ بە لە دروستکردنی سیسـتەمێك کـە هـەمووان لەسـەری ڕێـك بکـەون. مەبەسـت لـەوە ڕێگەپێنەدانی قوتابییەکانە کە بێ مۆڵەتوەرگرتن قسە بکەن، بـەڵکوو دەبێـت دەسـت هـەڵبڕن، بـۆ ئـەوەی سیسـتەمەکە بەسوود بێـت. پێویسـتە لـە سـەرەتادا لەگـەڵ قوتابییـەکانت باسی بکەیت تا سوودەکانی بزانن. دواتـر لـە جێبەجێکردنیـدا توووند بە و ئاسان مەبە لەگەڵ ئـەو قوتابییانـەی کـە پێشـێلی دەکەن تا سیستەمەکە بەکەم نەبینن.

* ئەو قوتابییانەی پەیوەسـت دەبـن بـەم سیسـتەمەوە بـە شێوەیەکی جیاواز ڕۆڵیان بەرز بنرخێنە.

* ئەو قوتابییانەی پێشێلی دەکەن بەبەردەوامی ئاگاداریان بکەرەوە.

**١٩- کاتی فێرکردن (ڕێنماییـیەکان):** بیرۆکـەی نووسـەرەکە بریتییـە لـەوەی دوای پرسـیارکردنت، کـاتێکی تـەواو بـە

قوتابییەکان بدەیت تا بتوانن لێی تێبگەن و وەڵامەکە ئامادە بکەن. یەکەم قوتابی کە دەست هەڵدەبڕێت، هەڵمەسێنە بۆ وەڵامدانەوە. دەبێت شارەزابیت لەوەی هەر پرسیارێك چەند کاتی دەوێت. بەمەش دەرفەتێك بەو بەهرەمەندە دەدەیت کە زوو فێر نابێت.

نووسەرەکە پێشنیاری کرد ناونیشانی ئەم بیرۆکەیە بۆ "کات بۆ بیرکردنەوە تەرخان بکە!" بگۆڕدرێت.

**٢٠ـ ئاراستەکردنی پرسیارەکان بۆ قوتابییانی پۆلەکە:**

کاتێك لە وانەکەدا پرسیار دەکەیت وەك هەمیشە هەمان ئەو قوتابییانەی لە وانەی پێشوو دەستیان هەڵبڕی، دەست هەڵدەبڕن بۆ وەڵامدانەوە، لەبەرئەوە پێشنیار دەکرێت کە شێوازی پرسیارکردنەکە بگۆڕدرێت تا قوتابییەکانی تر کاردانەوەیان هەبێت و بەشداری بکەن.

بۆ نموونە: پرسیارەکە لەسەر وەرەقەیەك بنووسرێت و کاتێکی کورتیان بۆ نووسینی وەڵامەکان پێ بدرێت. دواتر داوایان لێ بکەیت ئەوەی نووسیویانە بیخوێننەوە. بەم جۆرە بۆمان دەردەکەوێت زۆرێك لە قوتابییەکان توانای وەڵامدانەوەیان هەیە و ئەو بەربەستی ترسەی کە نەیدەهێشت بەشداری بکەن، نامێنێت.

**٢١- چۆنیەتیی مامەڵەكردن لەگەڵ وەڵامی هەڵەدا:** كاتێك قوتابییەك بە هەڵە وەڵام دەداتەوە لەوانەیە بە"نەخێر" وەڵامی بدەیتەوە كە ئەمەش باوەڕبەخۆبوونی كەم دەكات (هەرچەندە لە سەرزەنشكردن و گاڵتەپێكردن باشترە) یان دەڵێیت، "زۆر باشە" كە ئەمەش هەڵەیە هەم بۆ ئەو یان قوتابییەكانی تریش. باشتر و درووستتر وایە كە سەیری لایەنێكی ڕاستی وەڵامەكەی بكەیت. جەخت بخەیتە سەری، یان بڵێیت من دەزانم لە چ لایەنێكەوە سەیری پرسیارەكەت كردووە، یان هەڵەی هەندێك لە بلیمەتەكان باس بكە و پێیان بڵێ چۆن سەركەوتوو بوون كاتێك بەردەوام بوون و سوودیان لە هەوڵە ناسەركەوتووەكانیان وەرگرت.

**٢٢- ڕێگایەكی جێگرەوە لە ئاڕاستەكردنی پرسیاردا:** بیرۆكەكە پێكهاتووە لە دابەشكردنی پرسیارەكان بەشێوەی كارت. گەر (كۆمەڵەیەك) لە ڕەنگێگ پێكهاتبێت و لە پشتیەوە دەستەواژەیەك هەبێت بۆ یارمەتیدانی قوتابییەكە تا وەڵامەكە بزانێت لەگەڵ ڕەچاوكردنی:-

* بۆ قوتابییەكانی دەربخەیت كە دابەشكردنەكە هەڕەمەكییانەیە (لە ڕاستیدا دابەشكردنەكە بەپێی ئاستی قوتابییەكانە).

* ئـەو دەسـتەواژانەی وەك یارمەتییـەك دراون، لەگـەڵ ئاستی هەر کۆمەڵەیـەك دەگونجێـت بـەوەی هـەر کۆمەڵەیـەك کەموکورتیی هەبوو، هاوکاریکردنەکە زۆرتر دەبێت.

ئـەم شـێوازە هاوکـاریی قوتابییـەکان دەکـات تـا بەشـداری بکەن و لەڕووی ئاستەوە، لەگـەڵ هاوەڵەکانیانـدا، هەسـت بـە یەکسانی بکەن.

**٢٣ـ سـوودوەرگرتن لـە بیرۆکـە باشـەکانی بابەتـەکانی تـر:** زۆربـەی کـات ڕێگاکـانی مامۆسـتا لـە ڕێکخسـتنی پۆلـدا، بـە شـێوەیەکی بـەردەوام دووبـارەی دەکاتـەوە، لـە یـەك سەرچاوەوەن کە پەیوەندیی بـە وانەیەکـەوە هەیـە، بۆیـە لـە شـێوازەکانی نوێکـاری ئەوەیـە ئەزموونـەکانیان لەگـەڵ مامۆستایانی تردا کە پسپۆڕیی جیاوازیان ئـاڵوگۆڕ پـێ بکـەن لە ڕێی گفتوگۆکردن یان سـەردانیکردنەوە. بەمـەش شـێوازی نوێ دەدۆزێتەوە لەگەڵ بابەتەکەیدا دەگونجێت.

**٢٤ـ قەدەغـەکردنی شـەڕەکان:** لـە دیـاردە تێکـدەرەکانی ڕێکخستن و کۆنترۆڵکردنی پۆل، شەڕکردنی قوتابییەکانـە. لـە ڕاسـتیدا بـەبێ بـەئاگابوونی مامۆسـتا یـان چـاودێر ناتوانیـت پێشـبینیی ڕوودانـی شـەڕی قوتابیـەکان بکـەین. لەبەرئـەوە باشترین ڕێگا بۆ ئەوەی لەم شـەڕ (ناکۆکییانـە) بـەدوور بیـت

ئەوەیە زوو تەداخولی چارەسەرکردنی بکەیت، ئەوەش بەپێی زانینی سەرەتای ناکۆکییەکە و دەرەنجامە سەرەتاییەکانی. ئەم بابەتەش بە ئەزموون و ڕاهێنانەکان دەکرێت.

**٢٥ـ لەدوای وانەیەکی خراپ، چی دەکەیت؟** لە کاتێکدا لە وانەیەکدا کۆنترۆڵی پۆلەکەت لەدەست دا، ئەوا لە وانەی دواتردا ئەم بابەتە پشتگوێ مەخە، بەڵکوو سەرزەنشتی ئەو قوتابییانە بکە هۆکاری ژاوەژاوەکە بوون، گەرچی ناچاربوویت داوای هاوکاری لە بەڕێوەبەرانی قوتابخانەکەیش بکەیت. ڕەتکردنەوەت بۆ هەڵسوکەوتی ئەم کۆمەڵە قوتابییە بۆ قوتابییەکانی تر ڕوون بکەرەوە کە سزای یاسایی خۆیان وەردەگرن.

**٢٦ـ دووبارە کۆکردنەوەی ڕابەری لقی پۆلەکان لە یەک پۆلدا:** ئەم بیرۆکەیە بەشی دووەمی بیرۆکەی پێشترە. مەبەست لێی توندیی خۆت بەرانبەر ئەو قوتابییانەی هۆکاری ژاوەژاوەکە بوون بۆ قوتابییەکان دەربخەیت. نووسەرەکە پێشنیار دەکات لە دوای دەرکردنی لاسارەکان، بە هەماهەنگی لەگەڵ بەڕێوەبەرایەتیی قوتابخانەکەدا دووبارە بە شێوەی تاکەکەسی واتە لە هەر وانەیەک یەک قوتابی و (بەپێی ژمارەشیان) بگەڕێندرێنەوە. دوای ئەوە بڕگەی

کۆکردنـەوەیان دێـت لەگەڵیشـیدا زۆر پێویسـتە کـە بنـەمای خۆبێئاگادەرخستن جێبەجێ بکرێت.

**٢٧- بەڕێوەبردنی تاقیکردنەوەکان:** ناونیشانی تاقیکردنەوە کاریگەرییەکی ئەرێنی لەسـەر قوتابییـەکان دروسـت دەکـات، بۆیە نووسەرەکە پێشنیار دەکـات تاقیکردنـەوەکان بـە نـاوی جیاواز دابنرێن، وەك:

* برگەکانی بەبیرهێنانەوەی چێژبەخش.
* برگەکانی دەتوانیت چەندت بەبیر بێتەوە.
* برگەکانی بە زانیارییەکانت سەرسامم بکە.

**٢٨ـــ چـۆن وا لـە قوتابییـەکانت دەکـەیت ئەرکـەکانیان بنووسـن؟** ئەرکـەکان دەبنـە بـار نـەك تـەنها بەسـەر قوتابییەکانەوە، بـەڵکوو بەسـەر مامۆستاکەیشـەوە لـە کـاتی چـاودێریکردن و ڕاسـتکردنەوەیاندا. ئەمـەش هەنـدێ جـار لـە بەهای پەروەردەیی کەم دەکاتـەوە. لەبەرئـەوە ڕەچاوکردنی هەندێ بابەت یارمەتیی دەدات تا ئامانجە پەروەردەییـەکانی لـێ بەدەسـت بهێنێـت، ئـەویش لەوانـەی نووسـەرەکە پێشنیاریان دەکات پێکهاتوون:

* ئـەرکێکی زیـاتر لـە توانـای ڕاسـتکردن (سـەحکردن)ت مەدە.

* کاتێکی دیاریکراوی تەواویان پێ بدە لەنێوان پێدانی ئەرکەکان و کاتی وەرگرتنەوەیاندا.

* لەماوەی ئەو کاتەی پێت داون بۆ ئەرکەکە، جەخت لەسەر ئەرکەکە و کاتەکەی بکەرەوە بۆیان. ئەمەش بۆ بیرخستنەوەی خۆت و ئەوانیشە.

* لە کاتی دواکەوتنی هەندێك قوتابی لە پێدانی ئەرکەکە، بە سزای دەرەنجامی دواکەوتنی لە پێدانی ئەرکەکە لە کاتی خۆیدا، ئاگاداریان بکەرەوە.

* ئەرکی دواتر ڕادەست مەکە، پێش ئەوەی ئەرکی یەکەم وەرنەگریتەوە و سزای ئەو قوتابییانە نەدەیت کە ئەرکەکە لە کۆتا کاتی دیاریکراویدا ڕادەست ناکەن.

چونکە ئەم خاڵانە دەرفەتی ڕاستکردنەوەت پێ دەبەخشن و قوتابییەکانیش هەست بە بەهای ئەرکەکە دەکەن.

**تێبینییەکی گرنگ:** گەر هۆکار و پێویستییەك و ئامانجێك لە وەڵامدانەوەی پرسیارێکدا نەبێت، ئەوا هیچ ئەرکێك بە قوتابییەکان مەدە تا سەرقاڵیان بکەیت، یان بۆ ئەوەی سەرچاوەکانی ئامادەکردنی وانەکە تەواو بکەیت، چونکە قوتابییەکان مافی خۆیانە چێژ و خۆشی لە کاتەکانی دەرەوەی قوتابخانە وەربگرن و چالاکیی تر ئەنجام بدەن.

**٢٩- ئەرکی خۆش و چێژبەخش دابنێ:** باشتر وایە پێکهاتەی خۆشییەکە لەگەڵ بەرژەوەندییەکانیان و ئەو شتانەی گرنگی پێ دەدەن بگونجێت. بەو شێوەیە ئەرکی داهێنەرانە و بەهرەمەندانە دەردەچێت نەك نەرێنییانە.

تێبینی دەکەیت زۆربەی کات ئەرکەکان لە هەمان کتێبن و ئەمەش وای لێ دەکات کە دووبارەی ئەرکەکانی قوتابخانە بن و هەندێك جار مامۆستایش نەیبینیوە.

**٣٠- ڕاستکردنەوە (سەحکردن):** بۆ ئەوەی لە درێژیی ماوەی ڕاستکردنەوەی دەفتەری قوتابییەکان ڕزگارت بێت نووسەرەکە پێشنیاری ئەوە دەکات پێوەری دیاریکراو دابنێیت کە لەگەڵ قوتابییەکان لەسەری ڕێك بکەون. بۆ ئەوەی ئەنجامی ڕاست بەخێرایی و وریاییانە بناسنەوە پێشنیاری ئەوە دەکرێت ئەرکی قوتابی بەسەر سێ بواردا دابەش بکرێت ئەوانیش: ڕەنج، ئەنجام و کوالێتی.

بۆ نموونە: بۆ هەر بوارێك ١٠ نمرە بدرێت، چونکە دەتوانیت ئەنجامی ئەرکەکانی قوتابییەکان خێراتر بدەیتەوە. بەم شێوەیە ئەنجامەکان بەسەر کەموکورتییەکان و بەهێزی زۆر ورد دابەش کراون و تێگەیشتنی قوتابییەکانیش خاڵی بەهێز و لاوازیان لەخۆ دەگریت. گەر توانیت گشت ئەرکەکانی

قوتابییـــەکان ڕاســـت بکەیتـــەوە کـــە پێـــت داون، بـــەهۆی چـاودێریکردنتەوە بۆیـان قوتابییـەکان ناچـار دەبـن پابەنـدی راپەڕاندنی ئەرکەکان بن کە پێیان سپێردراوە.

**٣١- کۆنترۆڵکردنی کۆتاییی وانەکە:** بۆ ئەوەی قوتابییـەکان لـە وانەکـەدا کاردانـەوەیان هـەبێت لەگەڵتـدا، نووسـەرەکە پێشنیار دەکات پێش ئەوە وێنەیەکی وانەکە هەڵبواسـیت کـە ئەمانە لەخۆ بگرێت:

أ- بۆ وانەی داهاتوو ئەمە ئەنجام دەدەین.

ب - بۆچی ئەنجامی دەدەین؟

لەژێر هەردوو خاڵەکەدا پێکهاتە سەرەکییەکانی بە کـورت و پوختی و بە شێوەیەکی ڕوون و سـادە دابنـێ. لـە سـەرەتای وانـەی نوێـدا دووبـارە وێنەکـە هەڵبواسـەرەوە و دەسـت بـە وانەکە بکە.

نووسەرەکە پێی وایە ئەم چالاکییە پلـەت لای قوتابییـەکان بـــەرزتر دەکـــات و چـــەندێتی بەبەرنامـــەییی تۆیـــان بـــۆ دەردەکەوێت و لەبەڕێوەبردنی پۆلەکەیشدا هاوکارییت دەکات لەڕێی ڕوونکردنەوەی وانەکە و ئامانجەکانی بۆ قوتابییەکان.

# بەشی چوارەم
# چارەسەرکردنی کێشە باوەکان

**١ــ هاوکاریی باروبۆخە تاکەکەسییەکان:** لەوانەیە باری قوتابییەك پێویستی بە هاوکاری بێت و لە کاتی سەرقاڵبوونت لەگەڵی هەندێك ژاوەژاو و ناڕێکی دروست بکات، بۆیە پێشنیار دەکرێت ڕێگەی چارەسەرەکە بەم شێوەیەی خوارەوە بێت:

قوتابییەکە بێت بۆ لات و لە تەنیشتتدا بوەستێت نەك لە بەردەمتدا، بۆ ئەوەی بتوانیت لە هەمان کاتدا قوتابییەکان ببینیت و هاوکاریشی بکەیت. بەردەوام قوتابییەکان ئاڕاستە بکە، بۆ ئەوەی هەست بکەن چاودێرییان دەکەیت.

**٢- بەدەستهێنانی پاڵپشتی:** ئەمەیش لە ڕێگەی دروستکردنی پەیوەندیی باشە لەگەڵ دەوروبەرت لە کاری پەروەردەیی وەك: "سەرپەرشتیار، بەڕێوەبەری خوێندنگا و مامۆستایان" بۆ ئەوەی پاڵپشتی و هاوکاریی زانیارییانە و بابەتییانەت پێشکەش بکەن و بە هەمان شێوە تۆیش پێشکەشیان بکەیت.

**٣ـ ستراتیژیی چاوی کوێر:** چارەسەرکردن و وەستان لە کاتی هەر هەڵسوکەوتێکی بێزارکەری قوتابی، وانەکە دوادەخات و سەرلێشێواوی دروست دەکات. بۆیە نووسەرەکە پێشنیاری ئەوە دەکات کە (چاوی کوێر)ت هەبێت پێی ببینیت. لەگەڵ هەر هەڵەیەك کە دەکرێت نەوەستیت تا بەپێی پێویستیی تەداخول و فەرامۆشکردن بۆ بەردەوامیی وانەکە هەڵسەنگاندنی بۆ بکەیت. ئەمە بۆ شارەزایی و کەسایەتیی و پێزانینی مامۆستاکە دەگەڕێتەوە.

لە کولتووری خۆماندا ئەم ڕەفتارە بە"خۆبێئاگادەرخستن" ناودەبرێت.

شاعیریش دەڵێت:

"گێل سەرکردەی گەلەکەی نییە، بەڵکوو ئەو کەسە سەرکردەیەکە خۆی بێئاگا دەردەخات."

**٤ـ ڕەفتاری خراپی شاراوە:** هەندێك لە قوتابییەکان بەڕێز و ڕەوشتبەرزن، بەڵام لە هەمانکاتدا هیچ چالاکییەك و پەرۆشییەك لە بەشداریکردنی پرۆسەی خوێندنەکەدا نانوێنن، لەبەرئەوە ئاستیان لاوازە. کاتێك سەرقاڵ دەبیت بە چارەسەرکردنیانەوە، ئەمە هەلێك دەبێت بۆ لاسارەکان تا گاڵتە و یاری بکەن. تۆش لە هەمانکاتدا ناتوانیت قوتابییە

ئاست لاوازەکە بەجێبهێڵێت بۆ ئەوەی زەرەر لە خۆی نەدات و قوتابییەکانی تریش لە بێباکیدا چاوی لێ نەکەن.

هەر بۆیە نووسەرەکە پێشنیاری تێبینیکردنت بۆ قوتابییەکە دەکات. چەند ئامانجێکی کاتیی بۆ دیاری بکە تا بتوانیت لە هەر ئاستێکدا بەدییان بهێنیت. پێویستە ئەوە بزانیت کە بەڕەوشت و بەهێزبوون شتێکی زۆر باشە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بوونی لە قوتابخانە بۆ فێربوونە، بۆیە پێویستە ڕەنجێکی زیاتر بدات لەم بوارەدا. لە زۆربەی کاتدا قوتابییەکە دەست بە هەوڵدان و خوێندن دەکات کاتێک چاودێریی بەردەوامی تۆ دەبینێت.

**٥ـ سەرکێشی لەناو پۆلدا:** نووسەرەکە پێی وایە کە پێویستە لەگەڵ ئەو قوتابییانەی گاڵتە بە هاوەڵەکانیان دەکەن بەتووندی دژیان بوەستینەوە. لە سەرەتاوە بە ئاگادارکردنیان و ئاگادارکردنی بەڕێوەبەری قوتابخانەکە، ئینجا دەرکردنیان لەناو پۆلدا و لەلایەن ئەو کەسەی کە لە قوتابخانەکە دەسەڵاتدارە سزا بدرێت و سوود لەو کەسانە وەربگیردرێت کە شارەزاییان هەیە لە چارەسەرکردنی کێشەکە ئەگەر لە گاڵتەپێکردن بەردەوام بوون.

**٦ـ یاسای ئاڵتونیی تایبەت بە بیروڕا:** یاساكە بریتییە لەوەی ڕێگە نەدەیت قوتابییەكە لە كاتی وانەكەدا بە گفتوگۆكردن كاتی وانەكە بەفیڕۆ بدات، لەبەرئەوە لە سەرەتاوە پێی بڵێ كە لەدوای وانەكە قسەت لەگەڵ بكات. یەكسەر بگەڕێوە سەر وانەكە، ئەگەر سوور بوو، بەوپەڕی هێمنییەوە پێی بڵێ لە كاتی وانەكەدا قسە لەسەر بابەتەكە ناكەین. زۆربەی كات لەم بوارەدا لە گفتوگۆكردن دەوەستێت، بەڵام گەر هەر بەردەوام بوو، ئەوا بەپێی ئەو سیستەمەی كە هەیە لە پۆلەكە دەری بكە.

**٧ـ چۆن مەترسییە جیاوازەكان دوور دەخەینەوە:**

مەبەستی نووسەرەكە لە وشەی"جیاواز" (ئەو بیروڕا و بوارانەیە كە ئارەزووی گفتوگۆكردنیان دەكەیت). بۆیە نووسەرەكە ئاگادارت دەكاتەوە بۆ باسی ئەو بابەتانەی كە قوتابییەكان گرنگییان پێ دەدەن و ئارەزوویان دەكەن ڕاتنەكێشن تا كاتی وانەكە بكوژن. گەر باسی هەندێكیان كرد، ئەوا داوایان لێ بكە دوای وانەكە قسە لەسەر بابەتەكە بكەن.

**٨ـ جادووی سەوداكردن:** كاتێك قوتابییەكان ئەو ئەركەی پێت داون، قبووڵی ناكەن، سەودایان لەگەڵ بكە (مەبەستی

نووسەرەكە ڕێككەوتنە) بە كەمكردنەوەی ئەركەكە یان كەمكردنەوەی سزای تەواونەكردنی ئەركەكە، بۆ ئەوەی هیچ سەرلێشێواوییەك دروست نەبێت. كەسێك هەڵبژێرە كە بەناوی هەموو قوتابییەكانەوە قسە بكات. ئاگادار بە، لە سەوداكرنەكەدا ئاسان بە.

**٩ـ گواستنەوەی قوتابییەكە لە شوێنی خۆی:** زۆر جار گۆڕینی شوێنی قوتابییەك بۆ شوێنێكی تر دەبێتە هۆی سەرلێشێواندن. ئەگەر قوتابییەكە لە شوێنی هاوپۆلەكەیدا ئەوەی ڕەتكردەوە، ئەوا بارودۆخەكە خراپتر دەبێت. لەبەرئەوە نووسەرەكە ڕێگایەكی گونجاو بۆ گواستنەوەی شوێنی قوتابییەكە دەدۆزێتەوە كە ڕێگاكەش ئەمەیە:

* پێش ئەوەی شوێنی بگۆڕیت چەند جارێك قوتابییەكە ئاگادار بكەرەوە.

* بڕۆ بەرەو ئەو كورسییەی كە دەتەوێت قوتابییەكەی بۆ بگوازیتەوە، كورسییەكە دوور لە مێزەكە ڕابكێشە، بڕۆ بۆ ئەو شوێنەی قوتابییەكە تێیدا دانیشتووە و دەستت بە شێوەیەكی كراوە بۆ قوتابییەكە ڕابكێشە (نیو مەتر لە نێوانتاندا بێت) بە دەستەكەی ترت ئاماژە بۆ كورسییەكەی تر بكە و بە دەنگێكی هێمن داوای گۆڕینی شوێنەكەی بۆ

شـوێنی ئـەو کورسـییە لـێ بکـە. گـەر داواکاریەکـەتی ڕەتکـردەوە، هـەر بـە هـەمان شـێوە داوای لـێ بکـەرەوە و لەگەڵیشیدا بڵێ، "من دەمەوێت وانەکەم تەواو بکەم، بەڵام تۆ ڕێگری دەکەیت بۆیە من چاوەڕوانیی تۆم."

زۆربەی کات لەم دۆخەدا قوتابییەکان گوێڕایـەڵیت دەکـەن. گەر قوتابییەکە لە ڕەتکردنەوەکە بـەردەوام بـوو، بـۆ ئـەوەی کۆتایی بە باتەکە بهێنیت، پێـی بڵـێ، "باشـە، کـاتی زیـاتری هاوڕێکانت بەفیڕۆ نادەم لـە کۆتـاییی وانەکەتـدا شـتێکی تـرم لەگەڵتدا دەبێت." پێویستە لەسـەرت سـزایەکی پـەروەردەیی بدەیت کە لەگەڵ بارەکەیدا بگونجێت، چونکە قوتابییـەکان چاوەڕێی تۆن تا بزانن چی لەگەڵدا دەکـەیت. گـەر ڕێگرییـەك نـەبێت بـۆ ئـەم کـارەی، ئـەوا لـە هەنـدێك قوتـابی دەکـات هەمان شێواز و ڕەفتاری ئەوت لەگەڵ بکەن.

**١٠ـ یەکپۆشی:** یەکێك لە یاسـاکانی قوتابخانـە پابەندبوونـە بە یەکپۆشییەوە. ئـەی چـۆن مامەڵـە لەگـەڵ ئـەو قوتابییانـە دەکـــەیت کـــە ســـوورن لەســـەر پابەندنـــەبوونیان بـــە یەکپۆشییەوە؟

نووسـەرەکە پێـی وایـە ئەمـە بـە ڕێگـەی ئاگادارکردنـەوەی یەکەم و دواتر لە کاتی خوێندنت لە سـەرەتای وانـەدا دەبێـت

کە بە ئاماژەیەکی ڕوونی سووك لە پابەندنەبوونیان ئاگاداریان بکەیتەوە. دوای ١٥ خولەك تیانووسی تێبینییەکان دەربکە و بڵێ پێویستە ناوی سەرپێچیکەرەکان بنووسرێت تا بە بەڕێوبەرایەتیی قوتابخانەکە ڕابگەیەنین. بەم جۆرە زۆربەیان پابەندی یەکپۆشییەکە دەبن. ئەو کەسەی سووربوو لەسەر سەرپێچییەکە، بینێرە بۆ بەڕێوبەرایەتیی قوتابخانەکە تا سزای بدەن. لەگەڵ بەڕێوبەرانی قوتابخانەکەیش ڕێك بکەوە گەر پابەندی یاسا و سیستەمەکە نەبێت ڕێگە بە هاتنی بۆ ناو پۆل نەدرێت.

**تێبینی:** بۆ قوتابییەکانی ڕوون بکەرەوە کە بۆچی ئەم ڕێسایانەت گرتە بەر.

**ئاگاداری:** خۆت نیگەران مەکە گەر بەڕێوبەرانی قوتابخانەکە لەگەڵ قوتابییەکان بن نەك تۆ.

ئەمەش واتای خراپی و نەرێنیی تۆ نییە، بەڵکوو کێشەکە لە بەڕێوبەرانی قوتابخانەکەیە پێش قوتابییەکە. لەبەرئەوە بەڕێوەبەرایەتییەکە پێویستی بە چارەسەرە، بۆیە پێویستە قایلیان بکەیت کە زۆر پێویستە پابەندی یاساکان بن.

**١١ــ مۆبایل:** بوونی مۆبایل لەناو پۆلدا، هۆکارێکە بۆ سەرقاڵبوونی قوتابییەکان. لەبەرئەوە ئەگەر سیستەمی

قوتابخانەکە مۆبایلی قەدەغە کردبێت، ئەوا دەبێت هەڵبسێت بە دەرکردنی قوتابییەکە و مۆبایلەکەی لێ بسەندرێت. بەلام دەبێت ئاگاداری بکەیتەوە کە مۆبایلەکە لە شوێنێکی پارێزراودا دەبێت.

**١٢- زاڵبوون بەسەر ڕۆتینیدا:** هەندێك لە کێشەکانی ناو پۆل، بەهۆی بێزاریی وانەکەوە ڕوودەدەن کە بێزاری بۆ قوتابییەکان دروست دەکات ؤ لەوانەیە لە سەرەتای وانەکەیش بەم شێوەیە بێت. گەر وانەکانی پێشووش بە هەمان شێواز و بیروڕا بووبێتن و دەتەوێت لەم بێزارییە ڕزگارت بێت، ئەمانە چەند پێشنیارێکن بۆت:

* شوێن و جووڵەی قوتابییەکان بگۆڕە وەك: لە کۆتایی پۆلەکەدا بوەستە، تاوەکوو دانیشتنەکەیان بگۆڕن و سەیری لای مێزەکەت بکەن و بانگهێشتیان بکە تا وێنەیەکە ببینن بێنەوەی بەرزی بکەیتەوە.

* بەرنامەیەکی تەلەڤزیۆنی یان کۆمپیوتەر کەشێکی خۆش و چێژبەخش دروست دەکات بۆ خوێندکارەکان. زۆر لەسەری مەدوێ و بیکە بە بابەتێك لە وانەکەتدا.

* دیارییەکی ناو کارتۆن بەرز بکەرەوە کە بزانن چی تێدایە ئەم دیارییەش بۆ دیارترین و باشترین قوتابی بێت و لە کۆتایی وانەکەدا پێی ببەخشە.

١٣ــ پێنووسم پێ نییە: بۆ ڕزگاربوونت لەم کێشەیە، نووسەرەکە پێشنیارت بۆ دەکات کۆمەڵێك پێنووست هەبێت، بۆ ئەوەی لەدەستیشیان نەدەیت، ستیکەرێکی ڕەنگاوڕەنگ بهێنە و ناوی قوتابییەکە و ڕەنگی پێنووسەکەی لەسەر بنووسە بەم شێوەیە پێنووسەکانت لەدەست نادەیت.

١٤ــ پێشتر ئەوەمان ئەنجام داوە: لەوانەیە لە کاتی ئەنجامدانی یەکێك لە چالاکییەکانت هەندێك قوتابی بەم ڕستەیە ڕووبەڕووت ببنەوە لەبەرئەوە تووڕە مەبە، بەڵکوو پێیان بڵێ:

* ڕاستە، بەڵام ئێمە ناچارین دووبارەی بکەینەوە.
* بەڵێ، بەڵام لە لایەنێکی جیاوازەوە بوو.
* لەبەرئەوەی بابەتەکە گرنگە پێویستە جەختی لەسەر بکەینەوە.
* ئەمە پێداچوونەوەیەکە بۆ وانەکە.

تێبینی: گەر ئامانجێکی ڕاستت نەبێت لە ئەنجامدانی چالاکییەکە، دووبارەی مەکەرەوە تا بێزارکەر نەبێت.

**١٥- هەست بە خراپیی تەندروستیی قوتابییەکەت بکە:** ئەم دەستەواژەیە ڕاستی یان درۆی قوتابییەکە لەخۆ دەگرێت. بۆ ئەوەی جیاوازی لە نێوانیان بکەین و دڵنیابینەوە، بۆ ماوەی ١٠ خولەك چاودێریی قوتابیەکە بکە. گەر ڕاستیت بینی، شێواز و ڕێسای یاسایی بۆ گەیاندنی بە نەخۆشخانە بگرە بەر.

**١٦- باسکردنی مامۆستایەکی تر:** گەر قوتابییەك لەبەردەمتدا ڕەخنەی لە مامۆستایەك گرت، ئەوا ڕێگەی پێ مەدە و بڵێ ئەمە پەیوەندی بە ئێمەوە نییە. گەر سووربوو لەسەر قسەکردنت سەبارەت بە بابەتەکە، ئەوا بە کێشەیەك دایبنێ و بیگەیەنە بەڕێوبەرایەتیی قوتابخانەکە و لەگەڵی توند بە.

**١٧- گیرۆدەبوونی هەرزەکارەکان:** لەوانەیە هەندێك قوتابیی هەرزەکار بەهۆی هەرچییەکەوە بێت، گیرۆدەی مامۆستاکەیان ببن. چارەسەری ئەم بابەتە، فەرامۆشکردنیەتی. گەر هەوڵی دا بابەتی نوێت لەگەڵدا بکاتەوە، بینێرە بۆ یەکێك لە مامۆستاکان. لە کاتێکدا نامەی بۆ نووسیت، ئەوا بەڕێوبەرانی قوتابخانەکەی لێ ئاگادار بکەرەوە و بەبەردەوامی و بە شێوەیەکی ئاسایی بەبێ هیچ

جیاوازییەك لەگەڵ قوتابییەکانی تردا هەڵسوکەوتی لەگەڵدا بکە.

**١٨ـ لێدوانی بەدکارانە لە شەقامدا:** گەر هەندێك قوتابی لەناو شەقامدا–لە دەرەوەی قوتابخانە–لێدوانی خراپیان بەرانبەرت دا و تانەیان لێ دایت، ئەوا هیچ کاردانەوەیەکی خێرا ئەنجام مەدە، بەڵکوو تا کاتی قوتابخانە دوای بخە. بە کۆبونەوەت لەگەڵ قوتابییەکە و سەرپەرشتیاری قوتابیەکە–دایك، باوك–بە ئامادەبوونی یەکێك لە بەڕێوبەرانی قوتابخانەکە، لەسەر هەڵسوکەوتی خراپی ئاگاداری بکەنەوە و بەپێی ئەو سزایەی دانراوە سەبارەت بەم هەڵسوکەوتەی سزابدرێت و باشتر وایە کۆبوونەوەکە بە لێخۆشبوونت لێی کۆتایی پێ بێت، بۆ ئەوەی بارودۆخەکە بۆ باری سروشتی خۆی بگەڕێتەوە.

# بەشی پێنجەم
# دەرکردنی پاداشت و سزا

**١ـ سزای دەستبەسەرکردنی دوای تەواوبوونی دەوام:**
نووسەرەکە پێی وایە سیستەمی سزای مانەوە لە قوتابخانە دوای تەواوبوونی دەوام، گەر هەندێك جار سوودی هەبووبێت، ئەوا زەرەریشی هەیە:

* زیادبوونی گرژی لەگەڵ قوتابییەکەدا.
* زۆربوونی کاری نووسینی مامۆستاکە.
* بەفیڕۆدانی کات لە چاودێریی مامۆستا بۆ جێبەجێکردنی سزاکە.
* کات و ڕەنجی زیاتر بەفیڕۆ دەدەیت، گەر سزاکە جێبەجێ نەکەیت.
* خراپیی پەیوەندی لەگەڵ کەسوکاری قوتابییەکە.

نووسەرەکە پێی وایە پێش ئەوەی پەنا بۆ ئەم سزایە بەریت، ئاگادارییەکی ڕەسمی سەبارەت بە سزاکە دەربکرێت و هەوڵبدە ئاگادارکردنەوەکە لەبەردەم هەموو قوتابییەکاندا

بێت، ئەمەش وای لێ دەکات پاشگەز ببێتەوە پێش ئەوەی ناچاربیت لە بەجێگەیاندنی سزاکە.

**٢- بەرپرسانی سەرەکیی ئاژاوەکە بکەرە ئامانج:** کاتێك ئاژاوەیەکی گشتی لە پۆلەکەدا ڕوودەدات، شتێکی نادادپەروەرانە و بێبەهایە گەر سزای هەموو پۆلەکە بدرێت، چونکە زۆر جار کەسێك دەبێت کە بەشداری ئاژاوەکەی نەکردبێت و هەیە بەشداری کردووە، لەبەرئەوە پێویستە سزای یاسایی ئەو کەسانە بدەیت هۆکاری سەرەکیی ئاژاوەگێڕانەکە بوون.

**٣- ڕیزبەندیی سزاکان:** کاتێك ژاوەژاوێکی گەورە لەناو پۆلدا دروست دەبێت، بەتووڕەبییەوە سزای گشتی دەرمەکە، چونکە ئەمە دەبێتە هۆی دروستبوونی ژاوەژاوی گەورەتر، بەڵکوو بە دەنگێکی هێمن و توند یەك فەرمانی ئاشکرا و گشتی بدە هەموو هەڵسوکەوتە نەخوازراوەکان و سزاکەیش لەخۆ بگرێت.

بۆ نموونە: لە ئێستا بەدواوە جوڵەی هەر قوتابییەك لە شوێنی خۆی بەرپرسیاریەتی لەسەرە. گەر هەر سەرپێچیەك کرا، ئەوا بە شێوەیەکی ئاشکرا ناوی قوتابییەکە بۆ هەموو پۆلەکە بنووسە ئینجا دەست بە وانەکەت بکەرەوە.

٤- **ستایشی قوتابییان:** ژمارەیەك لە مامۆستایان کاتێك هەوڵدەدەن پۆلەکە ڕێك بخەن، دەستەواژەی نەرێنی بەکار دەهێنن، ئەمەش بارودۆخەکە دووژمنانەتر دەکات. خۆ ئەگەر ستایشی تایبەت بە ڕەخنەیی بەکار بهێنایە، نزیکتر دەبوو لە قبوڵکردن و کارپێکردنیان وەك ئەوەی بڵێت، خالد، تۆ کۆتا کەسیت کە پێشبینی دەکەم لە وانەوتنەوەکەم بموەستێنیت، چونکە تۆ هەمیشە گوێگرێکی باش بوویت.

٥- **هەڵبژاردنی قوتابی بۆ خەڵاتەکە:** مەبەست لەم بیرۆکەیە دانانی خەڵاتی هەفتانەیە بۆ ئەو قوتابییانەی پابەندی ڕێنماییەکانن. پێویستە خەڵاتەکە گونجاو و سەرنجڕاکێش بێت. دەتوانیت هەڵێك بەو قوتابییانە بدەیت کە سەرپێچییەکەیان ئەنجام داوە، بەڵام بە مەرجێك خەڵاتەکە لە ئامانجی خۆی دەرنەچێت.

٦- **سزای گونجاو:** دەبێت سزا لەگەڵ هەڵەکەدا گونجاو بێت، چونکە هەڵەی گەورە دەبێت سزایەکی بۆ دابنرێت کە بۆی گونجاو بێت و بە پێچەوانەیشەوە ڕاستە. لەبەر ئەوە ئەم گونجانە سیستەمی سزاکان لە بەڕێوەبردنی پرۆسەی پەروەردەییدا سەرکەوتوو دەکات و دادپەروەریش بەدی دەهێنێت.

**٧ـــ جیـــاوازیکردن لـــەنێوان قوتـــابی و هەڵســـوکەوتیدا:** نووسەرەکە ئاڕاستەکردنی ڕەخنە بە تەنها بۆ ئەو قوتابییەی کە هەڵەی کردووە بە کارێکی هەڵە دادەنێت، بەڵکوو پێی وایە پێویستە ڕەخنەکە باسکردنی هەندێك لایەنی ئەرێنیی قوتابییەکەیشی تێدا بێت. ئەمەش بۆ ئەوەی قوتابییەکە هەڵوێستی بەرگری لە خودی خۆی نەنوێنێت، بەڵکوو ڕەخنەکەت بە ڕەخنەگرتن لە هەڵەکەی نەك خودی خۆی دەبینێت.

**٨ـ پێدانی خەڵاتەکان:** شێواز و پاڵپشتیی بەردەوام بۆ خۆت دابنێ تا بتوانیت سوپاسی هەموو ئەو قوتابییانە بکەیت کاری باشیان ئەنجام داوە، بۆ ئەوەی ببێتە پاڵنەرێك بۆیان. دەشتوانیت هەر لە سەرەتای وانەکەوە خەڵاتەکان ڕابگەیەنیت تاوەکوو هەمووان هانبدەیت.

**٩ـ چێژبینین و خۆشیبینین لە ڤیدیۆ:** نووسەرەکە پێی وایە دەبێت قوتابییەکانت ئاسوودە بکەیت و ڕێگەبدەیت لە سنوورێکی دیاریکراودا چێژ و خۆشی وەربگرن. ئەمەش وەك پاداشتێك بۆیان و پێویستە بابەتەکە بە شێوەیەکی گونجاو هەڵبژێریت. با هەڵبژاردنەکەت ڕوون و ئاشکرا و توند بێت و دوودڵ مەبە لەو شتانەی ئارەزووی دەکەن.

# بەشی شەشەم
# بە شێوەیەکی گشتی

١ـ دانانی یانەیەك دوای قوتابخانە: ئەمەش ڕێگەیەکی کاریگەرە لە بوونیادنانی پەیوەندییەکی بەهێز لەگەڵ قوتابییەکاندا و کاریگەرە لەگەڵ قوتابیە لاسارەکانیشدا. بیرۆکەکە بریتییە لە دیاریکردنی ڕۆژێك بۆ دیداری قوتابییەکان لە ڕۆژێکی دیاریکراو لە دەرەوەی کاتی قوتابخانە، ئەمەش هاوکاریی مامۆستاکە دەکات تا ئەو هەڵسوکەوتە هەڵانە چارەسەر بکات و دەرکەوتنی کاریگەری لە هەستی قوتابییەکان بە گرنگیپێدانت دروست دەبێت.

٢ـ مامۆستای یاریدەدەر: مەبەست لە مامۆستای یاریدەدەر واتە هەبوونی دوو مامۆستا لە پۆلێکدا بۆ یەك بابەت. یەکێکیان سەرەکی بێت و ئەویتریان یاریدەدەر بێت. بە شێوەیەك کە هەردووکیان تەواوکەری یەك بن لە پرۆسەی فێرکردنی ناو پۆلدا. نازانم گەر ئەم تاقیکردنەوەیە لەلای ئێمە هەبێت یان نا وە ئەگەر بیستبێتم لە یەکێك لە قوتابخانەکانی کچاندا جێبەجێیان کردبێت.

**بیرۆكەی نووسەرەكە لە چالاككردنی ڕۆڵی مامۆستای یاریدەدەر پێكدێت لە ڕێگای:**

❖ سەیركردنی ستراتیژیی وانەوتنەوەكەت.

❖ بەشداریكردن لە چارەسەركردنی كێشەكان.

❖ ئەركی نوێ دەبەخشێت.

❖ ئامادەبوونی لەناو پۆلدا بۆ كۆنترۆڵكردنی لاسارەكان.

❖ بەشداریكردن لە وانەوتنەوەدا بۆ گۆڕانكاریكردن لە دەنگدا.

**٣ـ میوان لە وانەكەدا:** هێنانی میوانێكی بەهرەمەند یان خاوەن زانست كاریگەری لەسەر قوتابییەكان دروست دەكات بە تایبەت ئەگەر كەسی هەمان شوێن بێت، چونكە ئەمە چێژ و كاریگەری بۆ ناو پۆل زیاد دەكات. پەیوەندیی قوتابییەكان بە پۆلەكە زیاد دەكات و یارمەتیدەر دەبێت لە سەركەوتنی ئەو بیرۆكەیەی پلانتان بۆ داناوە و لە هەڵبژاردنی ڕابەر و بابەتەكەشدا هاوكار دەبێت.

**٤ـ پەیوەندیكردن بە بەرپرس و سەرپەرشتیارانی قوتابییەوە:** ئەم بابەتە لە قوتابخانەكاندا پەیڕەو دەكرێت. بەڵام ئەوەی ئەم پەیوەندییە سەردەخات هەڵبژاردنی وتەی گونجاوە بۆ ئەمە و ئاستی قوتابی ڕوون بكەرەوە هەروەها

ئەو شێوازەی لە چارەسەرکردنی کێشەی قوتابیدا دەتەوێت بە هەمان شێوە یارمەتیدەر دەبێت بۆ سەرکەوتنی ئەم پەیوەندییە.

**نموونەیەك بۆ ئەو دەستەواژانەی پێویستە لەگەڵ سەرپەرشتیارانی قوتابیدا بەکاریان بهێنیت وەك:**

بەڕاستی سەعید توانای باشی هەیە و پێویستە ئێمە پەرە بە تواناکانی بدەین. بۆ ئەوەی ئاستی خوێندنی بەرز بکەینەوە، ئێوە چ شێوازێك پێشنیار دەکەن تاوەکوو گەشە بە تواناکانی بدەین و چارەسەری ئەو هۆکارانە بکەین کە ڕێگری لە گەشەی تواناکانی دەکەن.

**٥- تۆمارکردنی ڕێککەوتن لەگەڵ سەرپەرشتیارانی قوتابی:** ئەمەش لە بابەتە گرنگەکانە لەو شتانەی لەگەڵ سەرپەرشتیاری قوتابییەکەدا لەسەری ڕێك کەوتن. بە نوسین و ڕێکەوتەوە هەمووی بنوسرێت. باشتریشە کە قوتابییەکە ئاگادار بکرێتەوە لەسەر ئەو شتانەی لەگەڵ سەرپەرشتیارەکەیدا لەسەری ڕێك کەوتن.

**٦- ڕیزکردنی پۆلەکە:** بۆ ئەوەی لە ڕێکخستن و کۆنترۆڵکردنی پۆلەکە و لە ئاسانیی جمووجوڵی ناو پۆل هاوکارت بێت ئەم خاڵانەی خوارەوە جێبەجێ بکە::

❖ قوتابییە لاسارەکان لە بەرانبەرتدا دابنیشن.

❖ جیاکردنـــەوەی قوتابییـــە لاســـارەکان و دوورخســـتنەوەی کورسییەکانیان لە یەکتر.

❖ لـەنێوان تەختەکـە و ڕیـزی پێشـەوەی پۆلەکـە مەودایـەك بەجێ بهێڵە.

❖ پێداویســـتییەکانت و کەلوپەلـەکانت لـە بەردەســـتت و لـە نزیکترین شوێن لەلاتەوە دابنێ.

**٧ــ یاسـا زێڕینـەکان و پلانـەکانی دانیشـتن:** لـە سـەرەتای ساڵی خوێندندا پێویستیت بە دابەشکردنی جێگای دانیشـتنی قوتابییەکان دەبێت کە بە شێوەیەك بێت خزمەت بە پرۆسەی فێرکردنـت بکـات و ڕەچـاوی قوتابییـە خـاوەن پێداویسـتییە تایبەتـەکانت و لاسـارەکانیش بکـەیت. پێویسـتە سـووربیت لەسەر دابەشکردنی جێگاکانی دانیشتن و گـوێ لـە داواکـاریی قوتابییەکان و سەرپەرشتیارەکانیان مەگرە ئەگەر هۆکـارێکی قایلکەریان نەبێت بۆ داواکانیان.

**٨ـ هێشتنەوەی قوتابییەکان لـە جێگاکانیـان:** نووسـەرەکە پێی وایە کە بەبێ مۆڵەتوەرگرتن، ڕێگـە بـە قوتـابی نـەدەیت بچێتە دەرەوەی پۆلەکە، لەبەرئەوە پێویسـتە لـە سـەرت کـە سیسـتەمێك دابنێیـت کـە لـە ڕێگەیـەوە پێداویسـتییەکانی

قوتابییان دابین بكەیت و بەبێ پەیڕەوكردنی ئەم سیستەمە و بەبێ ئەم سیستەمە، قوتابییەكان ناچاردەبن كە سەرپێچی ڕێنماییەكان بكەن.

٩- یاسای زێڕین بۆ گواستنەوەی جێگای كۆمەڵەیەك: كاتێك دەتەوێت قوتابییەكان لە هۆڵێكەوە بۆ هۆڵێكی تر بگوازیتەوە و ژاوەژاو و ناڕێكی دروست نەبێت، پێویستە لەسەرت پێشوەختە ئەو شوێنەی دەتەوێت قوتابییەكانی بۆ بگوازیتەوە ڕێك بخەیت و قوتابییەكان لە شوێن و كاتی گواستنەوەكە ئاگادار بكەیتەوە. دواتر گواستنەوەیان بەڕێكوپێكی و لە پێشوازیلێكردنیشیاندا ئامادە بە.

١٠- تەنیابوون لەگەڵ قوتابییەك: نووسەرەكە سەرزەنشتكردن و ڕێزلێنانی قوتابی كە بەتەنها خۆت و ئەوبن، بە هەڵە دەبینێت، تاوەكوو بە مامەڵەی خراپ لەگەڵ قوتابییەكە تاوانبار نەكرێیت. لەبەرئەوە ئاگاداری ئەوەبە سەرزەنشت و ڕێزلێنانت بۆی با لە بەردەم تەنانەت قوتابییەكدا بێت.

**١١- بیرخستنەوەی قوتابییەكان بە هۆكارەكانی هەڵسوكەوتی باش:** لە هۆكارەكانی ئاسانكاری بۆ قوتابییەكان تا پابەندی سیستەم و یاساكان بن، زانینی

هۆکار و گرنگی و ئامانجی سیستەمەکەیە ئەمەش لە پێدانی
فەرمان باشترە بێئەوەی ڕوونکردنەوەیان لەسەر بدەیت.

***

# بەشی حەوتەم
# چۆن خۆت بەڕێوە دەبەیت؟

**١ـ دوو خشتەکە:** خشتەی یەکەم زانراوە کە خشتەی وانەکانە، خشتەی دووەمیش پێکهاتووە لە دانانی خشتەیەك بۆ کاروباری ڕاستکردنەوە و چاودێریکردن کە لە کاتی تردا و جگە لە کاتی وانەکان ئەنجامیان دەدەیت. سوودی ئەم خشتەیە ڕێکخستنی کارەکەیە بۆ ئەوەی ئاسان ئەنجام بدرێت تا هەستی دڵەڕاوکێ لابدات کە مامۆستا لە کاتی کەموکورتی لە کردنی کارێکدا تووشی دەبێت نەشزانێت کەی دەتوانێت تەواوی بکات. لە خشتەکەشدا ڕەچاوی ئەوە بکات کە ڕاست و درووست بێت..

**٢ـ پێشەکییەکان:** ئەو کارانەی زانیاریی زۆرت هەبێت لەسەریان، ئەوا زۆربەی کات ناتوانیت تەواویان بکەیت، لەبەرئەوە پێویستە لەسەر مامۆستاکە بەپێی گرنگییان ڕیزیان بکات و دەشتوانێت بەپێی ئەم پۆلێنکردنەی خوارەوە پۆلێنیان بکات:

* زۆر گرنگە بیکەم.

* پێویستە بیکەم.

* باشترە بیکەم.

بەم شێوەیە دیاریکردنی کارەکان بۆی ئاسان دەبێت کە بە کامیان دەست پێ بکات و باشتریش وایە پرسیار لەخاوەن ئەزموونەکان بکرێت سەبارەت بە دروستیی ڕێکخستنەکە پێش ئەوەی دەست بە کارپێکردنی بکرێت.

٣ـ پشوودان (ئارامبوونەوە): لەوانەیە پیشەی فێرکردن خاوەنەکەی نیگەران بکات. ئەمەش کاریگەری لەسەر تەندروستیی مامۆستاکە دروست دەکات لە توانای کار و فێرکردنی لەناو قوتابخانەدا. لەبەر ئەوە لەو شتە سەرەکییانەی پێویستە مامۆستا فێری بێت، فێربوونی کارامەیی و ئارامبوونەوە (پشوودان)ە. کات بۆ خودی خۆی دابنێت تا چێژ لە ئارامبوونەوە وەربگرێت و پارێزگاری لێ بکات و بە کارە سەرەکییەکان و لەپێشینەکانی خۆی دابنێت.

لەو کارامەیی و ئارامبوونەوانەی کە نووسەرەکە ئامۆژگاریی مامۆستایانی پێ دەکات لە کاتی دەوامیان و کاتێك نیگەرانی و دڵەڕاوکێیان هەبێت بەکاری بهێنن:

* لەپی دەستت بەتووندی بگوشە و تا پێنج بژمێرە، ئینجا دەستت بکەرەوە. ئەمە چەند جاریك دووبارە بکەرەوە تا هەست دەکەیت دڵەڕاوکێکەت نامێنێت.

* سەرنج بخەرە سەر هەناسەدانت، بەقووڵی و هێواشی هەوا هەڵمژە و دە جار بەسە بەم شێوەیە هەناسە بدەیت تا ئارام دەبیتەوە.

* چەند دەتوانیت لە پۆلەکەدا بە پێ بڕۆ لەنێوان وانەکاندا و لە هەموو ئەمانە خێردارتر و باشتر، دیاریی پێغەمبەری هەڵبژێردراوە (دروودی خوای لەسەر بێت) کە بۆ نەمانی توورەیی ئامۆژگاری کردین بە دەستنوێژهەڵگرتن و نوێژکردن و حاڵەتگۆڕین. بە پێ ڕۆشتن یەکێکە لەو گۆڕانانەی کە دەتوانیت بەسەر حاڵەتی خۆتدا بیهێنێت.

٤ـ ڕاهێنانە وەرزشییەکان: بۆ ڕزگاربوون لە فشاری دەروونی ڕۆژانە (١) کاتژمێر بۆ ماوەی ٣ ڕۆژ لە هەفتەیەکدا بۆ وەرزشکردن تەرخان بکە. پشت بە وەرزش و هەوڵێکی تووندوتۆڵ مەبەستە و بەردەوام بە لەسەر کاتەکەی و لەبەر هەر هۆکارێك بێت وازی لێ مەهێنە.

**٥- ئێوارەت:** ڕۆژانێك لە هەفتەیەکدا بۆ خۆت دیاری بکە تا لە سروشتی کار دوور بکەویتەوە، چونکە ئەمە وزەت نوێ دەکاتەوە و بە چالاکییەکی گەورەتر دەگەڕێیتەوە بۆ کار.

**٦- چۆن لەسەرەتاوە ببیتەوە بە قوتابی؟:** نووسەرەکە ئامۆژگاریت دەکات کە وانەی ئێوارانت بخوێنیت، بۆ ئەوەی ڕۆتین بشکێنیت و بە هەمان شێوە زانیارییەکانت و پەیوەندییەکانت نوێ بکەیتەوە، هەروەها باوەڕبەخۆبوونیشت زیاد بکەیت و سەرکەوتن لە زانست و زانیاریی نوێدا بەدەست بهێنیت.

**٧- لە خێراییی دڵەڕاوکێ و نیگەرانیت کەم بکەرەوە:** نووسەرەکە پێی وایە گەر خۆت لەسەر لەسەرخۆیی و هێواشی و هێمنی ڕابهێنیت وەك لە خواردن و ڕۆیشتندا، ئەوا دڵەڕاوکێ و نیگەرانیشت لەسەرخۆ دەبێت. ئەمەش یارمەتیدەر دەبێت لە زانست و زانیاریبەخشینت و چالاکییت لە وانەوتنەوەدا.

**٨- هاوڕێکانت:** لەوانەیە هەندێ مامۆستا هەموو کاتی بە پیشەکەی بدات و هەندێك هاوڕێیەتیی ڕاستەقینە لەدەست بدات. ئەمەش وای لێ دەکات هەست بە کەموکورتی بەرانبەر خۆی بکات. ئەمە شتێکی گونجاو نییە بۆ دەروونی مامۆستا

بەڵکوو هەبوونی هەندێك هاوڕێی دەرەوەی پرۆسەی خوێندن هاوکاریی مامۆستا دەکات لە ئەنجامدانی پیشەکەی هەروەها هەستی گۆشەگیری لە کۆمەڵگادا نامێنێت، چونکە ژیانی مامۆستا هەمووی بۆ فێرکردن و پیشەکەی نییە و پێویستە لەسەری بۆنەکان بقۆزێتەوە تا سەردانی ئەو هاوڕێیانەی بکات.

**٩- حەمامکردن (خۆشۆردن)ێکی گەرم:** جەخت لەسەر ئەوە بکەرەوە کە پێش خەوتن حەمامێك بکەیت. هەوڵبدە بەئارامی بخەویت، تا درەنگانی شەو خۆت ماندوو نەکەیت بە کاری قوتابخانەوە

لەبەر ئەوەی ئەمە نیگەرانت دەکات و کاریگەری لەسەر وانەوتنەوە و زانیاریبەخشینت دەکات لە بەیانییاندا.

**١٠- لیست(تیانووس)ێکی بچووك بۆ ئەنجامدانی کارەکان:** تیانووسێکی بچووك بۆ خۆت دابنێ. لە کۆتاییی ڕۆژەکەدا ئەو کارانەی کە ئەنجامت داون و ئەو بڕیارانەشی کە داوتن تیایدا بنووسە. هەروەها باشترینی ئەو کارانەی کە زۆر باشبوویت لە ئەنجامدانیان و ژووانەکانت و پلانەکانیشت بنووسە. با ئەم تیانووسە لە بەردەستتدا بێت تا بتوانیت سوودی لێ وەربگریت.

## پێڕست

کتێبەکە لە ١٠٠ بیرۆکە پێکدێت بۆ یارمەتیدانی مامۆستا لە بەڕێوەبردنی پۆلەکەی و مامەڵەکردن لەگەڵ قوتابییاندا. ئەم خاڵانە بۆ حەوت بەش دابەش کراون کە ئەمانەن:

١- قوتابییەکانت بناسە.

٢- چۆن لە بەرانبەر گەردەلوولی پۆلدا پارێزگاری لە ئارامیت دەکەیت؟

٣- چۆن لەناو پۆلدا شتەکان لە شوێنی ڕاستی خۆیاندا بهێڵینەوە؟

٤- چارەسەرکردنی کێشە باوەکان.

٥- دەرکردنی پاداشت و سزا.

٦- بە شێوەیەکی گشتی: مەبەست لەمە بوونی چەند بیرۆکەیەکە کە لەناو پۆلدا پەیوەندیت لەگەڵ قوتابییەکانتدا لە پەیوەندیی مامۆستا بە قوتابییەکەیەوە زیاتر بێت.

٧- چۆن خۆت بەڕێوە ببەیت؟




2500

ناوەندی سارا

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

